بنکەی توێژینەوە (8)

# ئەتنۆدیمۆگرافیای باشووری کوردستان



د. عەبدوڵڵا غەفور

**ناوی کتێب: ئەتنۆ- دیۆگرافیای باشووری کوردستان**

- نووسینی: عەبدوڵلا غەفور
- نەخشەسازی ناوەوە: هەردی
- بەرگ: ڕێبین
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: (٨٦٥)
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ١٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب (٦)

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
www.mukiryani.com
asokareem@ maktoob.com
Tel: 2260311

# پێرستی تابلەکان

## سەربارى ئامارى

## بەرایی چاپی یەکەم

دانیشتوان لە باشووری کوردستاندا، زیاتر لە بەشەکانی دیکەی کوردستان لە ئالوگۆڕدان. لە ئەنجامی چەند فاکتەرێکی دیاریکراوی وەك: نەبوونی ئاشتی و ئاسایش و هێمنی، کۆچ و رەوپێکردنی بەردەوامی نێوچە جیاجیاکانی کوردستان و پۆلیتیکی بەعارەبکردن و کوشتنی بەکۆمەڵی خەڵکی کوردستان و...تاد. ئەمانە هەمووی پێکەوە، کارێکی زۆر گەورەیان کردۆتە سەر رێژەی زۆربوون یان کەمبوونی دانیشتوان و دابەشبوونی جوگرافی و پێکهاتەی نەتەوەیی و شوێنی ژیان (نشینمە) و گوزەرانی کۆمەڵانی خەڵك لە شار و گوندەکانی باشووری کوردستان بەتایبەتی و لەگشت کوردستانی گەورەدا بەگشتی.

نووسەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا، نێوچەی باشووری کوردستان وەك پارچەیەك لە هەموو کوردستانی گەورە وەرگرتووە، واتا مەبدەئی (یەك خاك) لەبەر چاو گیراوە، لەبەر ئەوە دەبینین، ناوی عێراق نەهێندراوە، جگە لەو شوێنانەی کە زۆر پێویستن و ئەو هێندە جێگایانەی پەیوەندی بەبەراوردکردن و رونکردنەوەی رووداوێکی دیاریکراوەوە یا هێنانەوەی فاکتەرێکەوە هەیە.

باشووری کوردستان وەك لەم پەرتووکەدا دیاریکراوە، دوور نییە بۆ هەندێ کەس جێگەی گومان بێ، لە وەڵامی هەموو ئەوانەدا دەڵێم: بەبێ بەڵگەی مێژوویی، هیچ شوێنێ لەخۆڕا لە نێو چوارچێوەی ئەم نێوچەیەی کوردستاندا کۆنەکراوەتەوە.

ئەم پەرتووکەی لەبەر دەستاندایە، بۆ هەمان کێشە تەرخانکراوە، کە وەختی خۆی نووسەر لە وتاری (باری ئەتنۆ- دیمۆگرافی لە باشووری کوردستاندا) بەزمانی رووسی باسیکردووە، رەنگە ئەمە وا لەهەندێ کەس بکات، بڵێن ئەم پەرتووکە هەمان وتاری ناوبراوە و بۆ سەر زمانی کوردی وەرگێڕدراوە، بەڵام لە راستیدا وانییە، بەڵکو بە ناوەڕۆك و داڕشتن و ژمارەو شیکردنەوەو بۆچوون، بەتەواوی لەگەڵ خودی وتارەکەدا، جیاوازی هەیە. بۆیە پێویستە وەك کارێکی سەربەخۆ تێیبروانین، بەڵام لەهەمان کاتدا، وتارەکەش وەك کارەکانی دیکەی نووسەر، لەکاتی خۆیدا بێسوود نەبووە و بۆ نووسینی ئەم پەرتووکەش کەڵکی لێ وەرگیراوە.

بۆ نووسینی ئەم پەرتووکە، گەلێ سەرچاوەی جیاواز بەکارهێنراوە، بەتایبەتی بڵاوکراوەی فەرمی لەسەرژمێری و ساڵنامەی ئاماری، بەڵام ناشکرێ ژمارەکان وەك شتێکی بێ چەندوچوون وەربگرین. چونکە نووسەر بەتەواوی دڵنیایە لەهەبونی گەلێ هەڵە و کەموکوڕی لە ژمارەکانی کە لە سەرچاوەکاندا هاتوون، بەڵام لە حیسابکردنیاندا دڵنیایە. هەروەها گەلێ پەرتووکیش کە بەزمانە جیاجیاکان نووسراون بەتایبەتی بۆ باسکردنی ئەم بەشەی کوردستان تەرخان کراون.

بەڕای من، زمانی کوردی بۆ نووسینی جوگرافیا هێشتا لاوازە. لەبەر ئەوە دوور نییە، هەندێ لەو زاراوانەی کە لێرەدا بەکارهاتوون، لای هەندێ نووسەری دیکە بە شێوەیەکی تر بەکاربهێنرێن. ئەم نووسینە، هەوڵێکی دیکەیە لە پێناوی ئاشناکردنی خوێندەواران بەم زمانە و بەهێزکردنی بناغەی زمانی جوگرافیا بە زمانی کوردی.

لەم باسەدا، نووسەر تەنیا ناوە نارەسمیەکانی بەکارهێناوە. بۆ نموونە، کۆیە لە جیاتی کۆیسنجق، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە، کە ناوە فەرمیەکانمان پشتگوێخستوە، بەڵکو بەرامبەر هەر ناوێکی نافەرمی ناوە فەرمیەکەمان ( ئەگەر هەبێ)، لە نێوان دوو کەوانەدا داناوە و هەوڵی زۆرمانداوە، ناوەکان وەك خۆی لەلایەن خەڵکی ناوچەکانەوە، چۆن دەگوترێ بەو شێوەیە بیاننووسین.

هیوادارم ئە پەرتووکە، شوێنی خۆی لەتەك نووسینەکانی دیکەی جوگرافیازانی کوردستاندا بکاتەوە، لەهەمان کاتیشدا، کەلێنێکی گەورەش لە نامەخانە هەژارەکەی کوردستاندا پربکاتەوەو ببێتە هاندەرێکی باش، بۆ نووسینی باس و لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل لەسەر جوگرافیای کوردستان.

نووسەر سوپاسی دکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز دەکات بۆ یارمەتی زمانەوانی.

**عەبدوللا غەفور**
**نینس هامن-سوێد**
**١٩٩٤-٧-٢٢**

# بەشی یەکەم

## دینامیکی ژمارەی دانیشتوان

سەرەتای ناونووسکردنی خەڵك لە باشووری کوردستاندا، بۆ سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان دەگەڕێتەوە. ئەم ئیمپراتۆریەتە، بەمەبەستی کۆکردنەوەی باج و گرتنی سەرباز و لەسەر داخوازی وڵاتەکانی ئەوروپا، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، لە ساڵی ١٨٣١، یەکەمین سەرژمێری خۆی کرد و تەنیا پیاو تۆمارکران. بەگوێرەی ئەم کارە ژمارەی ویلایەتی موسڵ (باشووری کوردستان) چەند سەد هەزار کەسێ بوون، سەرژمێری دووەم لە ساڵی ١٨٤١ بە ئەنجام گەیەنرا. سەرئەنجامەکەی وای نیشاندا، کە ژمارەی دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ، دوو تا سێ هەزار کەسێکی زیادکردووە، ئەمەیان دوا ناونووسکردن بوو، کە لەم ویلایەتەدا لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا کراوە.

دوای جەنگی یەکەمی جیهان، خاکی ئیمپراتۆری عوسمانی، لە نێوان بەریتانیای گەورەو فەرەنسا و رووسیا دا دابەشکرا. بەگوێرەی پەیمانی (سایکس بیکۆ) و (سان ریمۆ) لەسەر هەر ناوچەیەك دەوڵەتێکی سەربەخۆی لێ دامەزرێنرا، ویلایەتی موسڵیش، پاش گفتوگۆیەکی دوورودرێژ لە ساڵی ١٩٢٥ بە عێراقی عارەبی تازە دروستبۆوە، لەگەڵ هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرە پێکەوە لکێندرا.

دەوڵەتی تازە دروستبووی عێراق، بۆ جاری یەکەم بە پشتیوانی ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٩٢٧ خەڵکیان ناونووس کرد. ئەویش بەمەبەستی ئەوەی کە بزانن، ژمارەی دانیشتوان بەگشتی و ژمارەی هێزی چەکدار بەتایبەتی چەندە، جگە لە دەستنیشانکردنی باج وەرگرتن. لەوساوە تا ئەمڕۆ، شەش جاری دیکە سەرژمێری گشتی کراوە و بڕیاردراوە کە هەر دە ساڵ جارێ دووبارە بکرێتەوە و بڕیارەکەش بە گشتی پەیڕەوی لێ کراوە، جگە لە سەرژمێری گشتی پێنجەم

نەبێ، کە دەبوایە لە ساڵی ١٩٦٧ دا ئەنجام بدرایە، بەڵام لەبەر مەبەستی رامیاری- سەربازی، بەتایبەتی بەرپابوونی شۆڕشی کوردستان و دامەزراندنی هێزی پێشمەرگە، کە نەدەتوانرا ژمارەیان دیاری بکرێ، زانینی پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوانی باشووری کوردستانیش، دوو ساڵیان پێشخست، واتا لە ساڵی ١٩٦٥ دا ئەنجامیاندا.

ژمارەی دانیشتوانی باشووری کوردستان، بەگوێرەی ئەنجامی حەوت سەرژمێری گشتی، کە لە نێوان ساڵەکانی (١٩٢٧- ١٩٨٧) کراون، لە تابلی (١) دیاری کراوە.

**تابلی ١**

١

**گەشەکردنی ژمارەی دانیشتوانی باشووری کوردستان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٧-١٩٨٧**

| ساڵ | ژمارەی دانیشتوان | جیاوازی نێوان ساڵەکان | رێژەی زیادبوون % |
|---|---|---|---|
| ١٩٢٧ | ٦١٣٣٤٧ | - | - |
| ١٩٣٥ | ١٠١٠٩٠٥ | ٣٩٧٥٥٨ | ٦٤,٨ |
| ١٩٤٧ | ١٣٨٣٣٧٨ | ٣٧٢٤٧٣ | ٣٦,٨ |
| ١٩٥٧ | ١٨٢٢٣٩٠ | ٤٣٩٠١٢ | ٣١,٧ |
| ١٩٦٥ | ٢٢١٧١٠٩ | ٣٩٤٧١٩ | ١٧,٨ |
| ١٩٧٧ | ٣٣٠٣٣١٠ | ١٠٨٦٢٠١ | ٤٨,٩ |
| ١٩٨٧ | ٤٣٨٦٦٩٧ | ١٠٨٣٣٨٧ | ٣٢,٨ |

پێش شیکردنەوە، بەپێویستی دەزانین بە خوێنەرانی هێژای رابگەیەنین کە ژمارەکانی نێو تابلکە، بەهیچ شێوەیەك نەخشەیەکی راستمان نیشان نادەن، لەبەر کۆمەڵێ کەموکوورِی کە لە ئەنجامی کۆمەڵێ هۆی تایبەتدا، لە کاتی

سەرژمێری گشتیدا روویانداوە. گشت سەرژمێرییەکان، جگە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، لە بارودۆخێکی پڕ لە ئاڵۆزی رامیاریدا کراون، کە بۆتە هۆی تۆمارنەکردنی نەك هەزارەها خەڵك، بەڵکو دەیان ئاوەدانیش.

کۆمەلانی خەڵکی پێش ساڵەکانی شەست، بەچاوی پڕ لە گومانەوە سەیری سەرژمێری گشتییان دەکرد، لایان وابوو ئەو کارە بۆ سەندنی باج و گرتنی سەربازە، بۆیە بە هەر شێوەیەك بوایە، خۆیان لێ لادەدا، ئەم تێڕوانینەش تاکو ئێستا لە گوندەکاندا، بەتەواوی کۆتایی پێ نەهاتووە. هەروەها نەبوونی رێگەوبانی چاك بۆ ئۆتۆمبێل، لەپێش حەفتاکاندا ببووە هۆی پشتگوێخستنی تۆمارکردنی دانیشتوانی ئەو گوندانەی کە لە شوێنی سەخت دروستکرابوون.

خەڵك لە باشووری کوردستان، بەتایبەتی لە گوندەکان، ناونووسکردنی کچەکانیان بە پێویست نەدەزانی. لایان وابوو کە بەو کارە لە نێو کۆمەڵدا ناویان دەزڕێ بەگشتی کارێکی پێویست نییە. هەروەها ناونووس نەکردنی هەزاران لە کوردە کۆچکردووەکان، کە لەولاتانی دەوروبەر و ئەوروپا دەژین، جگە لەوەی کە خۆیان بە هاولاتی ئەو ولاتانەش دانەناوە. لەگەڵ ئەو هەموو هۆ نێگێتیڤانەشدا، کەچی هێشتا ژمارەکان، بۆ روونکردنەوەی گەشەکردنی ژمارەی دانیشتوان بێسوود نین.

دانیشتوانی باشووری کوردستان، وەك ژمارەکانی نێو تابلی ژمارە ١ نیشانمانی دەدەن، لەو نیو سەدەیەی دواییدا، ٣ ملیۆن و ٧٧٣ هەزار کەس زیادیکردووە. بەواتایەکی دیکە، ژمارەی دانیشتوان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٧-١٩٨٧، لە ٦١٣ هەزار کەسەوە، گەیشتۆتە ٤ ملیۆن و ٣٨٧ هەزار کەس. لەو سەردەمەدا، رێژەی زیادبوونی سالانە ٣,٨٪ بووە. هۆیەکانی ئەم زیادبوونە مەزنە بۆ چەند فاکتەرێك دەگەڕێتەوە:

### ١- بەرزیی ڕێژەی لە دایکبوون

ڕێژەی لە دایکبوون لە باشووری کوردستاندا، لە هەشتاکاندا دەوروبەری ٠,٠٤٥٪ (٤٥ لە هەزار) منداڵ بوو، ئەمەش نەك لە نێو چوارچێوەی سنووری کوردستاندا، بەڵکو لە گشت کیشوەری ئاسیادا، بەیەکێ لە بەرزترین ڕێژەی لە دایکبووان دادەنرێ، بۆ بەراوردکردن دەڵێین، ئەم دیاردەیە لە ساڵی ١٩٨٨، لە تورکیا ٠,٠٢٤٪، لە عێراق ٠,٠٤٣٪، لە ئێران ٠,٠٤٢٪، لە سوریا ٠,٠٤٤٪ بووە[٢]، بەرزی ڕێژەی لە دایکبووان لە باشووری کوردستاندا، بۆ چەند هۆیەکی گرنگ دەگەڕێتەوە، لەوانە، ڕێنەگرتن لە منداڵبوون، با ژمارەشیان لە نێو یەك خێزاندا زۆر بێ، چونکە لەنێو کۆمەڵگەی کوردستاندا واباوبووە، کە (هەموو منداڵێ ڕسقی لەگەڵ خۆیەتی)، نابێ دەست لەکاری خوا بدرێ. ژنهێنانی زوو (١٨ ساڵ و بەرەوژوور) و مێردکردنی زوو (١٦ ساڵ و بەرەو ژوور). ئەوەی ئاشکرایە، لەو ساڵانەی دواییدا کوڕ درەنگتر بەخاوەن ژن و کچانیش درەنگتر بە مێرد دەبن. هۆیەکەش بۆ باری ئاڵۆزی کوردستان و سەختی ژیان و بێکاری و نەبوونی خانووبەرەی سەربەخۆ و زۆری تێچونی ژنهێنان دەگەڕێتەوە. لە نێو کۆمەڵگەی کوردستاندا، کوڕی بێ ژن و کچی بێ مێرد، دوای تەمەنی ٢٠ ساڵی بەچاوی گومانەوە تەماشا دەکرێن و دەکەونە بەر پلارهاویشتن. ژنانی کوردستان لە منداڵبووندا، گەلێ بە پێزن، لە هەزار ژنی تەمەن (١٤-٤٥) ساڵیدا، (٨٠٠) یان منداڵیان دەبێ[٣]. زانستی دیمۆگرافی لەو ساڵانەی دواییدا، لەو ڕێژەیەی زیاتر تۆمارنەکردووە. ڕێگە نەگرتن لە منداڵبوون، چەکی دەستی دایك و باوکە بۆ بەرگریکردن لە ڕێژەی زۆربوونی مردن لەنێو منالاندا، پارێزگاریکردنی خێزان لە کوێربوونەوە، پشتی دایك و باوکە لە دوارۆژا.

## ٢- نزمبوونی ڕێژەی مردن

گومانی تێدا نییە، کە لەو ساڵانەی دواییدا، نزمبونەوەی ڕێژەی مردنی سروشتی، لەنێو دانیشتوانی کوردستاندا، زۆر بەئاشکرایی دیارە. بۆ نموونە، ئەم دیاردەیە لە پەنجاکانا، لە دەوروبەری ٠,٠٣٢٪ و لە هەشتاکاندا ٠,٠١٢٪ بوو، دیارە ئەمەش بۆ لە ناوبردنی هەندێ نەخۆشی خراپی وەك مەلاریا و خوریکە دەگەڕێتەوە، چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی جگەروخوێن و وەرەم و هەوکردنی گەدەو وگورچیلە و هەروەها زیادبونی ژمارەی دەزگای تەندروستی وەك نەخۆشخانەی گەورە و بچوك و دەرمانخانە و پێشکەوتن و پەرەدان بە جۆری خزمەتگوزاری لە نەخۆشخانەکاندا و زیادبوونی ژمارەی کاربەدەستان و خزمەتگوزاری نەخۆشخانەکان وەکو پزیشك و برینپێچ و سیستەر، ڕۆڵێکی هێجگار مەزنی لەو بوارەدا وازی کردووە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ڕێژەی راستی مردن لە باشووری کوردستان دا، لە هەشتاکان و بەرەو ژوور لە ٠,٠٢٥٪ کەمتر نییە، واتە بەرزترین دیاردەی دیموگرافی نەك هەر لەسەر ئاستی کوردستان، بەڵکو لە گشت وڵاتانی رۆژئاوای ئاسیادا هەیە. گرنگترین هۆیەکانی ڕێژەی مردن ئەمانەن: کوشتنی بەکۆمەڵی خەڵکی کوردستان (بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە ساڵی ١٩٨٨ دژی دانیشتوانی شارۆچکەی هەڵەبجەی جوانەمەرگ و شەهیدبونی پتر لە پێنج هەزار کەس بە یەك جار)، ئەنفالەکان (لە ناوچوونی ١٨٢ هەزار کەس)، بێ سەروشوێنکردنی هەشت هەزار بارزانی، کوشتنی دیکەی لابەلایی لەلایەن داگیرکەری دەوڵەتی عێراقەوە، وەك گرتن و لە سێدارەدانی خەڵکی، تیرۆرکردنی ناو شارەکان، شەڕەکانی پێشمەرگە و سوپای داگیرکەری ئەم وڵاتە، بۆمبارانکردنی کوێرانەی گوند و شارۆچکەکانی کوردستان، جگە لە جەنگی نێوخۆی هێزە رامیاریەکانی کوردستان. هەروەها کەمبونەوەی خواردەمەنی لە ئەنجامی ئابڵوقەی ئابوریدا، مەترسی بەردەوام لە رێ نەگرتن لە تەشەنەی نەخۆشی سامناك و چارەسەرنەکردنی لە بارودۆخی

ئەورۆی باشووری کوردستاندا و وێرانکردنی دەزگاکانی تەندروستی. بۆ نموونە، ژمارەی نەخۆشخانە روخاوەکان تاساڵی ١٩٨٨، گەیشتە ٣٥٠ نەخۆشخانە (سلێمانی- ١٨٧، هەولێر- ٤٤، کەرکوك- ٢١، شوێنەکانی دیکە- ٩٨)[٤].

ئەمانەو و جگە لەکەمی خزمەتگوزاری تەندروستی، بۆ نموونە ساڵی ١٩٨٥ لە باشووری کوردستان ٦٥ نەخۆشخانە (هەولێر- ١٤، دهۆك- ٨، سلێمانی- ١١، کەرکوك- ٢٩، نەینەوا- ٢٣) و ٤٤٨ دکتۆر (دکتۆری گشتی- ٣٢٥، دکتۆری شارەزا- ١٢٣) هەبوو. لە هەولێر- ٨٠ دکتۆر (گشتی- ٥٩، شارەزا- ٢١)، دهۆك- ٤٥ (گشتی- ٣٧، شارەزا- ٨)، سلێمانی- ٩٥ (گشتی- ٦٥، شارەزا- ٣٠)، کەرکوك- ٩١ (گشتی- ٦٠، شارەزا- ٣١)، نەینەوا- ١٣٧ (گشتی- ١٠٤، شارەزا- ٣٣)، یان یەك دکتۆر بۆ دەهەزار کەس و ١١٢٥٠ جێگای نووستنی نەخۆش هەبوو، واتە یەك جێ بۆ ٣٩٠ کەس[٥].

### ٣- کۆچکردنی دەرەوە بۆ کوردستان

باشووری کوردستان نێوچەیەکی دەوڵەمەندە و سامانێکی زۆری ژێرزەمینی - نەوت- هەیە و ئاو و هەوای خۆش و سازگاری هەیە و بەروبومی کشتوکاڵی هەمەجۆری زۆری لێ بەرهەم دەهێنرێ، ئەمانە هەموو وای لێکردووە، کە ببێتە نێوچەیەك سەرنجی خەڵکی رابکێشێ، بەتایبەتی بۆ دانیشتوانی عێراق، جگە لە بوونی سوپایەکی گەورەی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقی و هێنانی عارەبی خێڵەکی و دەشتەکی وجێگیرکردنیان لە کوردستاندا، بەمەبەستی بە عارەبکردن و گۆڕینی پێکهاتەی نەتەوەیی باشووری کوردستان، بۆ نموونە لە هەشتاکان، وەك دوایی بە درێژی باسی دەکەین، ٨٠-١٠٠ هەزار کەس بۆ نێو شاری کەرکوك و دەوروبەری گوێزرانەوە.

ژمارەی دانیشتوان لە ئەستانکاندا (پارێزگا)، وەك هەموو ولاتێك بەردەوام لە زیادبووندایە. لەو پەنجا ساڵەی نێوان یەکەمین (١٩٢٧) و دوایەمین (١٩٨٧)

سەرژمێری گشتی، دانیشتوانی نەینەوا لەبەراییبوون ١ ملیۆن و ١٧٣ هەزار کەس، سلێمانی- ٨٨٢ هەزار کەس، هەولێر- ٥٩٨ هەزار کەس، کەرکوك- ٥٢ هەزار کەس، خانەقین- ٢٢٧ هەزار کەس[٦] و لەدوای هەموویانەوە، دهۆك- ٤٣ هەزار کەس. (بروانە تابلی ٢).

**تابلی ٢**

## ژمارەی دانیشتوانی ئەستانەکانی باشووری کوردستان ١٩٢٧-١٩٨٧ [٧]

| سەرژمێر / ئەستان | ١٩٢٧ | ١٩٣٥ | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | ١٩٦٥ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەولێر | ١٧٢٥٦٢ | ٢٠٦١٦٩ | ٢٣٩٧٧٦ | ٢٧٣٣٨٣ | ٣٥٦٢٩٣ | ٥٤١٤٥٦ | ٧٧٠٤٣٩ |
| خانەقین* | ٩٢٢٠٢ | ١١٩٤٢١ | ١٤٦٦٤٠ | ١٩٠٢٢٨ | ١٩٩٩٨٣ | ٢٨٦١٨٩ | ٣١٨٨٦٥ |
| دهۆك | - | - | - | - | ١٤٥٨٣٤ | ٢٥٠٥٧٥ | ٢٩٣٣٠٤ |
| سلێمانی | ٦٩٤١٠ | ١٤٧٩٠٥ | ٢٢٦٤٠٠ | ٣٠٤٨٩٥ | ٣٩٩٧٦٨ | ٦٩٠٥٥٧ | ٩٥١٧٢٣ |
| کەرکوك | ٨٠٣٣٧ | ١٨٣١٧١ | ٢٨٦٠٠٥ | ٣٨٨٨٣٩ | ٤٧٣٦٢٦ | ٤٩٥٤٢٥ | ٦٠١٢١٩ |
| نەینەوا | ١٨٣٧٤١ | ٣٣٨٥٩٧ | ٤٦٨٣٦٨ | ٦٤٨٣٠٩ | ٦٢٦٤٥٩ | ٩٤٨٠٤٢ | ١٣٥٦٢٦٨ |
| هیدیکە** | ١٥٠٩٥ | ١٥٦٤٢ | ١٦١٨٩ | ١٦٧٣٦ | ١٥١٤٦ | ٩١٠٦٦ | ٩٤٨٧٩ |
| تێکرا | ٦١٣٣٤٧ | ١٠١٠٩٠٥ | ١٣٨٣٣٧٧٨ | ١٨٢٢٣٩٠ | ٢٢١٧١٠٩ | ٣٣٠٣٣١٠ | ٤٣٨٦٦٩٧ |

* مەبەست لەخانەقین قەزای خانەقین و مەندەلییە.

** مەبەست لە هیدیکە قەزای بەدرە و توزخورماتووە.

## پێکهاتەی ڕەگەزی (نێرومێ)

لەنێو دانیشتوانی باشووری کوردستاندا، ڕێژەی نێرینە لە ڕێژەی مێینە زیترە، ئەم دیاردە دیموگرافیە لە گشت سەرژمێریەکاندا بەروونی دیارە، هەروەها ڕێژەی هەردووکیان لە سالێکەوە بۆ سالێکی تر دەگۆڕێ، لەکەمکردن و زیادبووندایە. (بروانە تابلی ٣).

**تابلی ٣**

**ژمارەی نێرینە و مێینە لەنێو دانیشتوانی باشووری کوردستان ١٩٥٧-١٩٨٧** [٨]

| سەرژمێر | دانیشتوان (هەزار) | ژمارە | | % | | ڕێژەی جۆرەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | نێرینە | مێینە | نێرینە | مێینە | |
| ١٩٤٧ | ١٣٨٣ | ٦٤٤ | ٧٣٩ | ٤٦,٦ | ٥٣,٤ | ٨٧,١ |
| ١٩٥٧ | ١٨٢٢ | ٩٢٩ | ٨٩٣ | ٥١,٠ | ٤٩,٠ | ١٠٤,٠ |
| ١٩٦٥ | ٢٢١٧ | ١١٥٩ | ١٠٥٨ | ٥٢,٣ | ٤٧,٧ | ١٠٩,٥ |
| ١٩٧٧ | ٣٣٠٣ | ١٧٩٧ | ١٥٠٦ | ٥٤,٤ | ٤٥,٦ | ١١٩,٣ |
| ١٩٨٧ | ٤٣٨٧ | ٢٢٢٤ | ٢١٦٣ | ٥٠,٧ | ٤٩,٣ | ١٠٢,٨ |

هۆی کەمی ژمارەی مێینە لەچاو نێرینەدا، لەنێو دانیشتوانی باشووری کوردستاندا، بۆ ڕێژەی زیاتری مردن لە نێو ژناندا دەگەڕێتەوە، ئەویش بەهۆی سککردنی یەك لەدوای یەك و کارکردنی زیاد لەتوانای خۆیان، جگە لە منداڵ بەخێوکردن و کاری خێزان وکاری کێڵگە و کشتوکاڵیش، کەمتر بایەخدان بە تەندروستی ژنان لەچاو پیاواندا، بەتایبەتی ئەگەر منداڵ بوو، مۆڵدانی سوپای بێگانەو هێنانی فەرمانبەری ڕەبەنی عێراق.

هەمان نەخشە بەرچاو دەکەوێ، لە بەشە ئیداریەکاندا لە ساڵی ١٩٨٧، ڕێژەی جۆر لە ئەستانی هەولێر ١٠١,١ بوو ( ١٩٧٧- ١١٤,٢)، لە دهۆك- ١٠٥,٨

(۱۹۷۷- ۱۲۳,۹)، لـه سـلێمانی- ۱۰۳,۱ (۱۹۷۷- ۱۱۸,۸)، لەکـەرکوك- ۱۰۲,۹(۱۹۷۷- ۱۲۳,۳) لە نەینەوا- ۱۰٥,٤ (۱۹۷۷- ۱۰۲,۷).

**پێکهاتنی تەمەن**

دانیشتوانی باشووری کوردستان لەرووی پێکهاتنی تەمەنەوە، زۆر گەنجن، ئەمەش خەسڵەتێکی تایبەتییە، پەیوەندی بە دانیشتوانی هەموو وڵاتانی جیهانی سێیەمەوە هەیە. لەرووی تەمەنەوە دەتوانین دانیشتوان بەسەر سێ دەستەی گەورەدا دابەش بکەین:

**١- تەمەنی گچکە (٠ ـ ١٤)**

رێژەیان لەچاو گشت دانیشتواندا، لەساڵی ۱۹۸۷ دا نزیکەی ٤۹٪ بوو (۲ ملیۆن و ۱۳٦ هەزار کەس). ئەم رێژەیە لەچاو دەستەی تەمەنەکانی دیکەدا کەمێ زیترە، هۆیەکەشی بۆ یەك لەدوای یەکی منداڵبون دەگەڕێتەوە، ژنی وا هەیە تا ۱۸ منداڵی دەبێ، وای لێدێ دەگاتە قۆناغی سك نەکردن و منداڵ نەبوون.

**٢- تەمەنی ناوەنجی (١٥ ـ ٦٥)**

رێژە و ژمارەیان لە دەستەی پێشوو کەمترە، لە ساڵی ۱۹۸۷ دا لە دەوروبەری ٤۷٪ بوو (۲ملیۆن و ٥۳ هەزار کەس). ئەمەش بەهۆی ئەو زیانە گەورانەی کە توشی دەستەکانی ئەم جۆرە تەمەنەوە دێ، وەك نەخۆشی، کوشتن، رووداوی سامناکی دیکە.

**٣- تەمەنی گەورە (٦٥ و بەرەو ژوور)**

ئەم دەستەیە لە ناو دانیشتوانی باشووری کوردستاندا، ژمارەیان زۆر کەمە، لە ساڵی ۱۹۸۷ دا تەنیا ٤٪ پێك دەهێنا (۱۹۸ هەزار کەس). ئەمانە ئەو جۆرە کەسانەن کە بە شێوەیەك لە شێوەکان لە مردن رزگاریان بووە. دوور نییە رێژەکە

کەمتریش نەبێ، چونکە زۆر کەس هەن، لەبەر نەبوونی دیکۆمێنتی پێویست، تەمەنی خۆیان دەخەملێنن، وەك یاسا زۆر جار لە تەمەنی خۆیان زیاتر دەبێ، بۆ ئەوەی پلەو پایەیان لە نێو کۆمەڵدا زیاتر بێ.

## خوێندەواری

خوێندەوار بەو کەسە دەوترێ: کە توانای خوێندنەوەو نووسینی تێکستێکی بەئاسانی هەبێ و تەمەنی لە شەش ساڵان تێپەڕیبێ. ڕێژەی خوێندەواری لە ساڵی ١٩٨٧ دا، لە نێو دانیشتوانی باشووری کوردستاندا، نزیکەی ٥٦٪ بوو (١٩٦٥- ٥١٪ ) (١٩٧٧- ٥٤٪). ئەم ڕێژەیە بۆ ئەوڕۆ زۆر کەمە. هۆیەکانی کەمی خوێندەوار ئەمانەن: نەبوونی یا کەمی خوێندنگە، کەمی مامۆستا، باری ئاڵۆزی رامیاری کوردستان، هەڵوێستی کۆمەڵگە، قەلاچۆنەکردنی نەخوێندەواری لە نێو دەستەی تەمەن گەورەکاندا، کاولکردن بۆ نموونە، ژمارەی قوتابخانە رووخاوەکان هەتا ساڵی ١٩٨٨، گەیشتە نزیکەی دوو هەزار (سلێمانی- ٩٢٥، هەولێر- ٤٩٠، کەرکوك- ١٦٠، شوێنەکانی دیکە- ٤٢٥)[٩].

ڕێژەی خوێندەواران لە نێوان دانیشتوانی شارەکان (٥٨٪) زیاترە لەچاو دانیشتوانی گوندەکان (٢٥٪) و هەروەها لەناو پیاوان (٥٤٪) بەگشتی زیاترە لەهی ژنان (٢٩٪). ئەویش بەهۆی ئازادی پیاو و ڕێگە نەگرتن لەچوونی کوڕ بۆ قوتابخانە و پێویستی نێرینە بەخوێندن زیاتر لە مێینە لەکومەڵگەی کوردستاندا.

## سەرچاوە و پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

١ نووسەر لەم سەرچاوانەی تاوتوێ کردووە:

- المملكة العراقية، مديرية النفوس العامة، نتائج التعداد العام للسكان ١٩٤٧، الجزء الاول والثانی، بغداد، ١٩٤٥، صفحات عديدة.
- الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائی ديالی وكوت، لوائی السليمانية واربيل، مطبعة العانی – بغداد، ١٩٦١، صفحات عديدة.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزی للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٦٥، مطبعة الجهاز المركزی للاحصاء – بغداد، ١٩٧٣، ص ٣-١٨.
- الجمهورية العراقية وزارة التخطيط، جهاز المركزی للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧ لمحافظة اربيل، دهوك، ديالی، السليمانية، صلاح الدين، كركوك، نينوی، واسط. مطبعة الجهاز المركزی للاحصاء – بغداد -١٩٧٨، صفحات عديدة.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزی للاحصاء، مديرية الاحصاء السكانی، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧، لمحافظة اربيل، دهوك، السليمانية، صلاح الدين، كركوك، نينوی، واسط، مطبعة الجهاز المركزی للاحصاء – بغداد ١٩٨٨، صفحات عديدة.

٢- عەبدوللا غەفور، جوگرافیای دانیشتوانی کوردستان، چاپخانەی ئاپێك– ستۆکهۆڵم، ١٩٩٤، ل٩٤.

٣- شاكر خصباك (الدكتور)، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، مطبعة،شفيق– بغداد، ١٩٧٢، ص٨٢.

4- P.U‹K Genocide mass departation 3839 villages and towns destroyed in Iraq Kurdistan

٥- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزی للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٨٨، مطبعة الجهاز المركزی للاحصاء– بغداد،١٩٨٨، صفحات عديدة.

٦- نووسەر لەم سەرچاوانەی تاوتوێ کردووە:

- المملكة العراقية، مديرية النفوس العامة، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الاول و الثانى، بغداد، ١٩٥٤، صفحات عديدة.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عا ١٩٥٧ : لوائى ديالى وكوت، لوائى السليمانية وكركوك، لوائى الموسل و اربيل، مطبعة العانى –بغداد، ١٩٦١، صفحات عديدة.
- الجمهورية العراقية، وزاة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧ لمحافظة اربيل، دهوك، ديالى، السليمانية، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط،. مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء– بغداد، ١٩٨٧.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهز المركزى للاحصاء، مديرية الاحصاء السكانى، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧، لمحافظة اربيل دهوك، ديالى، السليمانية، صلاحالدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء– بغداد،١٩٨١.

٧- سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە :

- المملكة العراقية، مديرية النفوس العامة، نتائج التعداد للسكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الاول والثانى، بغداد، ١٩٥٤، صفحات عديدة.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧: لوائى ديالى و كوت، لوائى السلمانية وكركوك، لوائى الموصل و اربيل، مطبعة العانى – بغداد، ١٩٦١، صفحات عديدة.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧ لمحافظة اربيل، دهوك، ديالى، السلمانية، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء – بغداد، ١٩٧٨.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، مدرية الاحصاء السكانى، نتائج التعدد العام للسكان لسنة ١٩٧٧ لمحافظة اربيل، دهوك، ديالى، السليمانية، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة المركزى للاحصاء – بغداد١٩٨١.

٨- بگەڕێوە بۆ ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

- المملكة العراقية، مديرية النفوس العامة، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الاول والثانى، بغداد، ١٩٥٤، صفحات عديدة.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧: لوائى ديالى وكوت، لوائى السليمانية وكركوك، لوائى الموصل واربيل، مطبعة العانى -بغداد، ١٩٦١، صفحات عديدة.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزى لاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧ لمحافظة اربيل، دهوك، ديالى، السليمانية، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء -بغداد، ١٩٧٨.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، مديرية احصاء السكانى، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧، لمحافظة اربل، دهوك، ديالى، السليمانية، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء — بغداد، ١٩٨١.

تێبینی: ژمارەکانی ساڵی (١٩٢٧) (١٩٣٥) خەملاندنە لە سەر بنچینەی سەرژمێری ١٩٤٧ و ١٩٥٧.

9- PUK Genocide mass departation 3839 villages and towns desroyed in Iraq Kurdistan

# بەشی دووەم

## دابەشبوونی جوگرافی دانیشتوان

باشووری کوردستان لەرووی پانتایی و ژمارەی دانیشتوانەوە، لەدوای ناوچەی باکوورو رۆژهەلات دێ. بەگوێرەی بۆچوونی نووسەر، ئەم بەشەی وڵات ٨٧١١٧ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، ژمارەی دانیشتوانی بەگوێرەی ئەنجامی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٨٧، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆکرد، ٤ ملیۆن و ٣٨٧ هەزار کەس بووە (تابلی ٤).

**تابلی ٤**

**پانتایی و ژمارەی دانیشتوانی کوردستان بەگوێڕەی ناوچە (١٩٨٥)** [١]

| ناوچە | پانتایی | | دانیشتوان | |
|---|---|---|---|---|
| | کم٢ | ٪ | هەزار | ٪ |
| باکوور | ٢١٥٨٩٢ | ٤٠,١ | ٩٨٦٤ | ٤١,٠ |
| رۆژهەلات | ٢١٩٤٩٢ | ٤٠,٨ | ٩٢٠٤ | ٣٨,٢ |
| باشوور | ٨٧١١٧ | ١٦,٢ | ٤٣٨٧ | ١٨,٢ |
| رۆژئاوا | ١٥٢٦٤ | ٢,٨ | ٦٣٤ | ٢,٦ |
| تێکڕا | ٥٣٧٧٦٥ | ١٠٠,٠ | ٢٤٠٨٨ | ١٠٠,٠ |

دابەشکردنی دانیشتوان بەسەر پانتایی- چڕی گشتی دانیشتوان- ساڵی ١٩٨٧ لەدەوروبەری ٥٠ کەس بوو لەیەك کیلۆمەتری چوارگۆشەدا. تەنیا بۆ بەراوردکردن ئەڵێین، ئەمەیان دوو جار لەچاو ئەوەی ساڵی ١٩٦٥ زیاترە (٢٤ کەس) و کەرەت و نیوێك لەوەی ١٩٧٧ (٣٨ کەس) زیاترە، بەڵام زیادەکە بەگوێرەی چڕی ناوەندی کوردستانەوە (٤٥کەس) تەنیا (٥) کەسە.

چڕی دانیشتوان لەنێوان یەکە ئیدارییەکانی باشووری کوردستاندا، گەلێ جیاوازیان هەیە لەگەڵ یەکتردا، ئەویش لەبەر جیاوازی باری سروشتی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و بگرە رامیاریش. بۆ ئەوەی نەخشەی دابەشبوونی جوگرافیمان بەتەواوی بێتە پێش چاو، لەسەر ئاستی یەکە ئیدارییەکان:[٢] (ئەستان، قەزا، ناحیە) هەوڵی شیکردنەوەی ئەم دیاردە جوگرافییە دەدەین.

**تابلی ٥**

**چڕی گشتی دانیشتوان لەباشووری کوردستاندا (١٩٧٧)***

| ئەستان<br>قەزا ناحیە | کچگ | دانیشتوان | کەس/کچگ |
|---|---|---|---|
| **هەولێر** | ١٤٤٢٨ | ٥٤١٤٥٦ | ٣٨ |
| هەولێر | ٢٦٨٣ | ٢٧٠٢٧٠ | ١٠ |
| سەنتەر(هەولێر)* | - | ١٩٣٥٥٨ | - |
| عەنکاوە | ٩٤٠ | ٣٠٣٠٣ | ٣٢ |
| قوشتەپە | ١٢٧٣ | ٢٨٢٨٧ | ٢٢ |
| خەبات(هەنجیرۆك) | ٤٧٠ | ١٨١٢٢ | ٣٩ |
| مەخمور | ٢٦٣٧ | ٥٧٣٦١ | ٢٢ |
| سەنتەر | ٤٤٨ | ١٠٦٠٦ | ٢٤ |
| گوێڕ | ٥٠٩ | ٢٢٩٦٢ | ٤٥ |
| کەندیناوە(دیبەگە) | ٧٠٧ | ١٤٠٨١ | ٢٠ |

* تێبینی: ئەمانەی ناو کەوانەکان ناوی سەنتەری یەکە ئیدارییەکەیە، لەکاتی جیاوازی ناوەکە لەگەڵ یەکە ئیدارییەکە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| قەراج (باقرتە) | ٩٧٣ | ٩٧١٢ | ١٠ |
| کۆیە (کویسنجق) | ٢١٢٤ | ٤٨١٤٧ | ٢٣ |
| سەنتەر | ٦٤٧ | ٢٤٣٦٢ | ٣٨ |
| تەقتەق | ١٠٧٣ | ١٥٦٠٧ | ١٥ |
| شۆرش(دێگەڵە) | ٤٠٤ | ٨١٧٨ | ٢٠ |
| رواندز | ٢٩٠٤ | ٦٤٨٧٧ | ٢٢ |
| سەنتەر | ٥٠٩ | ١٥٢٧١ | ٣٠ |
| برادۆست (سیدەکان) | ١٦٩٠ | ٩٩٨٦ | ٦ |
| دیانا | ٢٩٠ | ٢٦٩٨٣ | ٩٣ |
| خەلیفان | ٤١٥ | ١٢٦٣٧ | ٣٠ |
| زێبار | ١٤٠٩ | ٢١٣٨٨ | ١٥ |
| سەنتەر(مێرگەسور) | ٤٧٧ | ١٠٦٢٥ | ٢٢ |
| بارزان | ٣٠٨ | - | - |
| مزوری بالاّ (شێروان مەزن) | ٦٢٤ | ١٠٧٦٣ | ١٧ |
| شەقلاوە | ١٧٥٢ | ٥٥٤٢٨ | ٣٢ |
| سەنتەر | - | ٩٨٦٩ | - |
| خۆشناو (هیران) | ٤٩٢ | ٦٣٦٥ | ١٩ |
| هەریر | ٤٦٠ | ١٦٣٧٢ | ٣٦ |
| سەلاحەدین | ٨٠٠ | ١٩٨٦٥ | ٢٥ |
| چۆمان | ٩١٩ | ٢٣٩٨٢ | ٢٦ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| سەنتەر | - | ٥٠٢٢ | - |
| باڵەك (گەڵاڵە) | ٦٧٤ | ١٥٧٨٧ | ٢٣ |
| حاجی ئۆمەران | ٥٤٥ | ٣١٧٦ | ٦ |
| **دهۆك** | **٦٣٧٤** | **٢٥٠٥٧٥** | **٣٩** |
| دهۆك | ١٥٠٩ | ١٠٢٥٧٤ | ٦٨ |
| سەنتەر | - | ٤٠١٩١ | - |
| سیمیێل | ٧٦٠ | ٣٦٨٠٧ | ٤٨ |
| دۆسكی (مانگێش) | ٣٩٢ | ١٥٠٥٢ | ٣٨ |
| زاوێته | ٣٥٧ | ١٠٥٢٤ | ٢٩ |
| ئامێدی (عەمادیە) | ٢٧٤٩ | ٧٣٥٩٣ | ٢٧ |
| سەنتەر | ٣٨٨ | ١٧٤٨٦ | ٤٥ |
| سەرسینگ | ٩٤٤ | ٢٥٨٩٩ | ٣٦ |
| نێروێ و رێكان ( بێبۆ) | ٧٢٠ | ١٣١٨٦ | ١٨ |
| بەرواری باڵا (كانی ماسی) | ٦٩٧ | ١٧٠٢٢ | ٢٤ |
| زاخۆ | ٢١١٦ | ٧٤٤٠٨ | ٣٥ |
| سەنتەر | - | ٣٠٢٩٩ | - |
| سلێڤانی(عاسهێ) | ٧١٠ | ٨٣٩٤ | ١٢ |
| سندی (شەرانش) | ٥٥٠ | ١١٨١٠ | ٢١ |
| گولی(باتوفا) | ٥٥٧ | ١٤١٢٨ | ٢٥ |
| رزگای(برایم خەلیل) | ٢٩٩ | ٩٧٧٧ | ٣٣ |

| سلێمانی | ١٦٤٨٢ | ٦٩٠٥٥٧ | ٤٢ |
|---|---|---|---|
| سلێمانی | ٢٣٢٢ | ٢٤٥٧٢١ | ١٠٦ |
| سەنتەر | - | ١٧٥٤١٣ | - |
| سەرچنار | ٦٨٠ | ٢٥٧٣٢ | ٣٨ |
| تانجەرۆ(عەربەت) | ٥٩٨ | ١٧٣٦٧ | ٢٩ |
| بازیان (تەیناڵ) | ٣٧٦ | ١٢٤٤٣ | ٣٣ |
| قەرەداغ | ٦٦٨ | ١٤٧٦٦ | ٢٢ |
| هەڵەبجە | ١٥٩٢ | ٩١٩٣٩ | ٥٨ |
| سەنتەر | - | ٢٢٤١١ | - |
| سیروان (کێلەسپی) | ٧٣٢ | ١٩٢٩٠ | ٢٦ |
| خورماڵ | ٢٤٨ | ١٣١٦٩ | ٥٣ |
| بیارە | ٢٢٨ | ١٤٣٦٨ | ٦٣ |
| شارەزوور(سەیدسادق) | ٣٨٤ | ٢٢٧٠١ | ٥٩ |
| پێنجوێن | ١١٢٧ | ٣٦١٦٥ | ٣٢ |
| سەنتەر | ٤١٧ | ٢٢٣٥٣ | ٥٤ |
| گەرمك | ٧١٠ | ١٣٨١٢ | ١٩ |
| شارباژێر | ٢٢١٣ | ٦١٢٠٨ | ٢٨ |
| سەنتەر(چوارتا) | ٧٠٣ | ١٧٥٤٧ | ٢٥ |
| سیوەیل(باسنێ) | ٣٦٠ | ١١٩٨٨ | ٣٣ |
| ماوەت | ٦٠٧ | ١٩١٨٥ | ٣٢ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| سروچك (بەرزنجە) | ٥٤٣ | ١٢٤٨٨ | ٢٣ |
| پشدەر | ١٤١٢ | ٤٩٨٦٧ | ٣٥ |
| سەنتەر(قەلادزێ) | ٣٣٦ | ٢٤٦٤٠ | ٧٣ |
| هێرۆ | ٢١٢ | ٨٢٥٧ | ٣٩ |
| ناودەشت (سەنگەسەر) | ٨٦٤ | ١٦١٥٠ | ١٩ |
| رانیە | ١٥٢٨ | ٥٣٣٦٢ | ٣٥ |
| سەنتەر | - | ٨٥٩٤ | - |
| مەرگە (بنگرد) | ٥٩٣ | ١٨٠١٢ | ٣٠ |
| رانیە (چوارقوڕنە) | ٦١٧ | ١٨٠٠٠ | ٢٩ |
| بێتواتە | ٣١٨ | ٨٧٥٦ | ٢٨ |
| دوکان | ١١١٠ | ٣١٦٤٦ | ٢٩ |
| سەنتەر | - | ٣٩٤٠ | - |
| سورداش | ٦٥٨ | ١٩٣٢٣ | ٢٩ |
| چناران (خەلەکان) | ٤٥٢ | ٨٣٨٣ | ١٩ |
| دەربەندیخان | ٥٥٤ | ٢٣٨٩٩ | ٤٣ |
| سەنتەر | ٥٥٤ | ٢٣٨١٩ | ٤٣ |
| چەمچەماڵ | ٢٤٦٩ | ٥٢٧٧٣ | ٢١ |
| سەنتەر | ٨٧٦ | ٢٥٣٠٥ | ١٠ |
| ئاغجەلەر | ٦٨٠ | ١٥٢١٢ | ٢٢ |
| سەنگاو(گۆپتەپە) | ٩٤٠ | ١٢٢٥٦ | ١٣ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| کەلار | ٢١٢٨ | ٤٤٠٥٧ | ٢١ |
| سەنتەر | ٣٦٤ | ٢٤٨٢٤ | ٦٨ |
| پێواز (باوەنور) | ٩٢٥ | ١١٧٤٣ | ١٣ |
| تیلەکۆ | ٨٣٩ | ٧٤٩٠ | ٩ |
| **کەرکوك** | **٩٤٢٦** | **٤٩٥٤٣٥** | **٥٣** |
| کەرکوك | ٥٣١١ | ٤٠٥٤٣١ | ٧٦ |
| سەنتەر | ٣٦٠ | ٣١٤٠٣٥ | ٨٧٢ |
| قەرەحەسەن (لەیلان) | ١١٣٢ | ٢١٨٨٦ | ١٩ |
| شوان (ڕێدار) | ٩١٥ | ١٦٩٠٢ | ١٨ |
| تازەخورماتو | ١١٣٧ | ١٤٩٣٠ | ١٣ |
| بایجی | ٥٥٥ | ١٦٧٩٧ | ٣٠ |
| داقوق | ١٢١٢ | ٢٠٨٨١ | ١٧ |
| حەویجە | ٢٤٢٣ | ٥٢١٧٩ | ٢٢ |
| سەنتەر | - | ٢١٩٧٥ | - |
| عەباس (جبور) | ١٠٣٥ | ١٢١٣٩ | ١٢ |
| ریاز | ١٣٨٨ | ١٨٠٦٥ | ١٣ |
| دووبز | ١٦٩٢ | ٣٧٨١٥ | ٢٢ |
| سەنتەر | ١٢١٧ | ٢٢٥٨٠ | ١٩ |
| پردێ(ئاڵتون کۆپری) | ٤٧٥ | ١٥٢٣٥ | ٣٢ |

| نەینەوا | ١٨٢٩٤ | ٩٢٩٣٨٥ | ٥١ |
|---|---|---|---|
| موسڵ | ٢٢٢٩ | ٤٧٧٨٥٩ | ٢١٤ |
| سەنتەر | ٩١٥ | ٤٢٩٨٨٣ | ٤٧٠ |
| بەعشیقە | ٥٢٧ | ٢٩٥٩٩ | ٥٦ |
| زاب | ٧٨٧ | ١٨٣٧٧ | ٢٣ |
| حەمدانیە | ١٢٨٧ | ٥٢٦٩١ | ٤١ |
| سەنتەر (قەرەقوش) | - | ١٢٨١٤ | - |
| کەلەك (ئاسکی کەلەك) | ٣٥٤ | ٨٩٧٣ | ٢٥ |
| نەمرود (خدر) | ٤٩٥ | ١٥٢٨٥ | ٣١ |
| بەرتلە | ٤٣٨ | ١٥٦١٩ | ٣٦ |
| تلکێف | ١٣٧٢ | ٥٦٢٤١ | ٤١ |
| سەنتەر | ٥١٠ | ٢٤٧٥٦ | ٤٩ |
| وانە | ٣٦٥ | ٩٢٢٩ | ٢٥ |
| ئەلقوش | ٤٩٧ | ٢٢٢٥٦ | ٤٥ |
| شەنگاڵ (سنجار) | ٤١٥٨ | ١٠٠٥١١ | ٢٤ |
| سەنتەر | ٢٦٢٢ | ٦٢٥٧١ | ٢٤ |
| شیمال(سنونی) | ١٥٣٦ | ٣٧٩٤٠ | ٢٥ |
| تەلەعفەر | ٤٧٤٣ | ١٣٢٨٥٤ | ٢٨ |
| سەنتەر | ١٢١٥ | ٦٦٥٨٢ | ٥٥ |
| زومار | ١٣٠٦ | ٣٠٧٩٩ | ٢٤ |
| عیازبە(ئاڤەگەنی) | ٧٣٢ | ١٤٥٠٤ | ٢٠ |

| رەبیعە | ١٤٩٠ | ٢٠٩٦٩ | ١٤ |
|---|---|---|---|
| شێخان | ١٥١٠ | ٣٦٤٢٢ | ٢٤ |
| سەنتەر(ئێسفنێ) | ٥٨٩ | ١٩٤٧٨ | ٣٣ |
| مرێیا | ٤٣٩ | ١٤٠٦٩ | ٣٢ |
| مزوری(ئەتروش) | ٤٨٢ | ٢٨٧٥ | ٦ |
| ئاکرێ | ٢٩٩٥ | ٧٢٨٠٧ | ٢٤ |
| سەنتەر | ١٩٠ | ١١٦٨٤ | ٦١ |
| ئەهلە(دینارتە) | ٩٧٧ | ١٠٣٤٥ | ١١ |
| عەشایر سەبعە (بەردەرەش) | ٨٣٤ | ٢٧٤١١ | ٣٣ |
| سورچی (بجێل) | ٣٧٤ | ٦٤٧٤ | ١٧ |
| گردەسێن | ٦٣٠ | ١٦٨٩٣ | ٢٧ |
| *** | *** | *** | *** |
| خانەقین | ٤٠٤٣ | ٩٨٨٧٠ | ٢٤ |
| سەنتەر | ١٢٨٧ | ٤٤٥٦٨ | ٣٥ |
| مەیدان | ٥٩٨ | ٢٥٦٣ | ٤ |
| قۆرەتوو | ٩٢٥ | ٥٩٤٧ | ٦ |
| جەلەولا | ٦٢٧ | ٢٨٩٥٨ | ٤٦ |
| سەعدیە | ٥٩٧ | ١٦٨٣٤ | ٢٨ |
| مەندەلی | ٦٨١٥ | ٥٩٧٦٦ | ٩ |
| سەنتەر | ١٤٩٠ | ٢٥٦٥٦ | ١٧ |

| بەلەدروز | ٢٢١٨ | ٢٤٩٢٣ | ١١ |
|---|---|---|---|
| قەزانیە | ٣١٠٧ | ٩١٨٧ | ٣ |
| کفری | ٣٣١٤ | ٥٤٩٠٤ | ٢٤ |
| سەنتەر | - | ١٠٧١٥ | - |
| جەبارە | ٤٨٧ | ٨٣١٦ | ١٧ |
| سەرقەڵا | ٤٦٥ | ٥٦٤٦ | ١٢ |
| کۆکس | ٤١٥ | ١٢٨٥٥ | ٣١ |
| قەرەتەپە | ٩٤٧ | ١٧٣٧٢ | ١٨ |
| شارەبان (مقدادیە) | ١٤٠٢ | ٧٢٦٤٩ | ٥٢ |
| سەنتەر | ٥٤٧ | ٥٣٤٩٤ | ٩٨ |
| مەنسوریە | ٨٥٥ | ١٩١٥٥ | ٢٢ |
| توزخورماتوو | ٣٨٠٠ | ٧٥٧٣٧ | ٥٢ |
| سەنتەر | ٢٦٨ | ٢٩٢٣٣ | ١٠٩ |
| ئامرلی | ٧٥٢ | ١٥١٠٤ | ٢٠ |
| سلێمان بەگ | ٣٨٨ | ٧١٧٦ | ٢١ |
| نەوجۆل | ٧٤٠ | ١٠٢٣١ | ١٤ |
| قادرکەرەم | ١٧٠٢ | ١٣٩٩٣ | ٨ |
| بەدرە | ٣٧٤٨ | ١٥٣٢٩ | ٤ |
| سەنتەر | ١٠٧٣ | ٦٣٢٦ | ٦ |
| زوربایتە | ٨٠٣ | ٣٥٧٥ | ٤ |
| جەسان | ١٨٧٠ | ٥٤٢٨ | ٣ |

ئاپۆرەترین  شوێن لە باشووری کوردستان، ئەستانی کەرکوکە (٥٣ کەس  لە ١ کچگ)، هۆیەکانیشی دەگەڕێنەوە بۆ: دەوڵەمەندی نێوچەکە بەسامانی ژێـرزەوی بەتایبەتی نەوت وەك چاڵاوگەکانی بابەگوڕگوڕ، زەنبوور، بای حەسەن، نەك تەنیا هەر لەکوردستان، بەڵکوو لەهەموو وڵاتـانی تـری رۆژهـەڵات و گـشت جیهـان، بەزۆری و سوکی نەوت و کەمی کرێی بەرهەمێنان ناویان دەرکردووە. ئەوە جگـە لە زەوی و زارێکی زۆری کشتوکاڵ، ئەمانە هەمووی بۆتە هۆی ئەوەی دەوڵـەتی عێراقی داگیرکەر بیر لەوە بکاتـەوە کـە نێوچـەکە بـەعارەب بکـا، بۆیـە هـەر لەسـاڵەکانی شەسـتەوە، بـەدەیان هـەزار عـارەبی دەشـتەکی و خێڵەکیـەکان، لەعێراقەوە بۆکوردستان بەگشتی و ئەستانی کەرکوك بەتایبـەتی گواسـتۆتەوە و لەو نێوچە نەوتیانەدا نیشتەجێی کردوون، بەو هیوایەی کە پێکهاتەی نەتـەوەیی دانیشتوانی باشوری کوردستان بگۆڕێ.

بەرزترین چڕی دانیشتوان لەناحیـەی سـەنتەری کەرکوکـە (٨٧٢ کـەس لـە ١ گچك) و نزمترین- ناحیـەی عـەباس (١٢کـەس)، هۆیەکەشـی بەپلـەی یەکـەم دەگەڕێتەوە بۆ هەڵکەوتنی یەکێ لەهەرە گەورەترین شاری باشووری کوردسـتان- کەرکوك و گچکەیی پانتایی لەچـاو ژمـارەی دانیـشتواندا، بەپلـەی دووەمـیش بۆنـەبوونی دامودەزگایـەکی پیـشەسازی و کـەمی زەوی کـشتوکاڵ...تـاد دەگەڕێتەوە.

لەڕووی چڕی دانیشتوانەوە، ئەستانی نەینەوا پاش کەرکوك دێ (٥١ کەس لـە ١ گچك) واتە کەمێك زیاتر لە ناوەندی چڕی لەسەر ئاستی باشووری کوردستان. هۆیەکانی بەرزی رێژەی چڕی دانیشتوان دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی دوو لەسـەر سێی گشت پیشەسازی نوێ لـەو ئەسـتانیەدا، بازرگانییـەکی گـەرمی نێوخـۆ و دەرەوە، کەگەورەترین خاڵی پێکگەیشتنی هاتووچۆی باشووری کوردستان، لەگەڵ دەرەوەدا پێکدێنێ، جگە لە رێژەی چوار لەسەر پێنجی پانتایی زەوی کشتوکاڵ و

لەگەڵ ئەوەش کە بەناوەندێکی زانستی و کلتوری گەورە دادەنرێ، بەهۆی دامەزراندنی چەندین دەزگای گەورەی فێرکردن و پەیمانگە و زانکۆ.

ناحیەی سەنتەر (موسڵ) لەگشت بەشە ئیداریەکانی تری ئاپۆرەترە، لێرە لە ۱ کچگ — ٤۷۰ کەس دەژی، هۆیەکەشی بە پلەی یەکەم بۆ هەڵکەوتی گەورەترین شاری (موسڵ -٤۳۰ هەزار کەس) باشووری کوردستان دەگەڕێتەوە. نزمترین پلەی چڕی دانیشتوان دەکەوێتە ناحیەی مزوری بالاَ (٦ کەس لە ۱ کچگ)، لەبەر ئەوەی زۆربەی زەوییەکەی شاخاوییە و بۆ کشتوکاڵ دەست نادا.

سێیەمین ئەستانی باشووری کوردستان لەرووی چڕی دانیشتوانەوە- سلێمانییە (٤۲کەس لە ۱ گچك)، ئەگەرچی ئەم ڕێژەیە لە ناوەندی چڕی گشتی وڵات کەمترە (۸کەس)، بەلاَم ئەمەی لێرەدا بەرچاومان دەکەوێ، ئەوەیە کە جیاوازیەکی زۆر گەورە لە نێوان بەرزترین و نزمترین پلەی چڕی دانیشتواندا نییە، ئەویش بەهۆی زۆری زەوی کشتوکاڵ و ئاوی باران، بەگوێرەی پێویست.

چڕی دانیشتوان لە ئەستانی دهۆك و هەولێر لەیەك دەچن (۳۹ کەس بە ۳۸ کەس لە ۱ کچگ)، واتە کەمتر لەنزیکەی ۱۰ کەس ئەگەر لەگەڵ ناوەندی چڕی دانیشتوان، لەباشووری کوردستاندا بەراورد بکەین. گومان لەوەدا نییە، کە ئەو ژمارەیە دوو جار زیاتر دەبوو، ئەگەر بهاتایە ئاوی باران بەئەندازەی پێویست هەبوایە. جیاوازی نێوان ناحیەکانیش زۆرنین، ئەویش لەبەر ئەوەی باری سروشتی نێوچەکان (باران و پلەی گەرما) و باری ئابووری (کەمی پیشەسازی) لەیەك دەچن.

## سەرچاوە و پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١- عەبدوللا غەفور، جوگرافیای دانیشتوانی کوردستان، چاپخانەی ئاپێك، ستۆکهۆلم، ١٩٩٤، ل١٤.

٢- بۆ زانیاری زیاتر، ساڵی ١٩٧٧ لە باشووری کوردستان ١٣٨ یەکەی ئیداری هەبوو (قەزا- ٥، ناحیە- ١٢٠).

٣- نووسەر لەم سەرچاوەی تاوتوێ کردووە:

- الجمهورية العراقية، الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٧٦، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء- بغداد، ١٩٧٦، صفحات عديدة

- الجمهورية العراقية، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان ١٩٧٧، لمحافظة اربيل، دهوك، السليمانية، صلاح الدين،كركوك، نينوى، واسط،مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء- بغداد، ١٩٧٨،صفحات عديدة.

# بەشی سێیەم

## پێکهاتەی نەتەوەیی و ئایینی دانیشتوان

### یەکەم: پێکهاتەی نەتەوەیی

دانیشتوانی باشووری کوردستان، لەچەند گروپێکی نەتەوەیی سەرەکی پێکهاتوون وەکو: هیندۆ- ئەوروپی،سامی، تورکی، ئەرمەن. تاکو ئێستا ژمارەو رێژەی نەتەوەییان بۆ رێژەی هەموو دانیشتوانی باشووری کوردستان، بەتەواوی دیارنییە، ئەویش بەهۆی چەند فاکتەرێکەوە، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە زمان بەبنەمای دەسنیشانکردنی ناسنامەی نەتەوەیی دانراوە، جگە لە شێواندنی پێکهاتەی نەتەوەیی رەسەن بەدەستی ئانقەست و تۆمارکردنی ئەندامانی خێزانی نەتەوە جۆربەجۆرەکان لەسەر نەتەوەی (برا گەورە) بەبیانوی نەبوونی جیاوازییەوە، هەروەها فەرامۆشکردنی زمانی زکماکی بەتایبەتی لەنێو منالاَندا، چ لەماڵەوە وچ لەدەرەوە، ئەویش بە بیانوی باشتر فێربوونی زمانی فەرمییەوە، فشارخستنە سەر نەتەوە بچوکەکان بۆ گۆڕینی پێناسەی نەتەوەیی خۆیان و تۆمارکردنی ناوی خۆیان لەسەر ناوی نەتەوەی گەورە، وەکو نووسینی ئاسوری بەکورد یا عارەب، نیشان نەدان ونەبوونی توانا بۆ پێداچونەوەو بەراوردکردن و لێکۆڵینەوە لە لیستی سەرژمێری گشتی، بەتایبەتی دوای پرکردنەوەی چونکە کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراقی، بەئارەزووی دڵی خۆیان و بەگوێرەی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، بۆ تواندنەوەی گەلی باشووری کوردستان، دەستکاری سەرئەنجامی لیستی سەرژمێرییەکان دەکەن و دەیانگۆڕن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کادیرانەی بەکارەکە هەڵدەستن، زۆربەی زۆریان لەو کادیرانەن کە جێی باوەڕی تەواوی دەوڵەتن، بۆیە هەموویان بەبیروباوەڕی شۆڤێنی گۆش کردوون و بەردەوام پەروەردەیان دەکەن، کە خەڵکی بەعارەب تۆمار بکەن، بەتایبەتی لەو ناوچانەدا کە فرە نەتەوەیە.

ژمارەو ڕێژەی نەتەوەکان لـە باشـووری کوردسـتان، لەسـاڵی ١٩٥٧ و ١٩٨٧ لەتابلی ٦ دا تۆمار کراوە. ئەوەی لێرەدا پێویستە بخرێتە ڕوو، ئەوەیە کە گومان لەهەموو ئەو ژمارە و ڕێژانە دەکرێ، ئەویش بەهۆی ئەو هۆیانەوە کەلە سـەرەوە باسمانکرد، لەگەڵ ناتەواوی لە حسابکردنی سەرچاوەکان.

**تابلی ٦**

**پێکهاتنی نەتەوەیی باشووری کوردستان ( ١٩٥٧-١٩٨٧)** [1]

| سەرژمێری | دانیشتوان (هەزار) | ژمارەو ڕێژە | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | کورد | عارەب | تورکمان | سریان | ئەرمەن | نەزاندراو |
| ١٩٥٧ | ١٨٢٢ | ١٠٠٢ | ٦٤٣ | ١١١ | ٥٣ | ؟ | ١٣ |
| | ١٠٠,٠ | ٥٥,٠ | ٣٥,٣ | ٦,١ | ٢,٩ | - | ٠,٧ |
| ١٩٦٥ | ٢٢١٧ | ١٢٢٨ | ٧٥٨ | ١٠٠ | ٣٨ | ٥ | ٨٨ |
| | ١٠٠,٠ | ٥٥,٤ | ٣٤,٢ | ٤,٥ | ١,٧ | ٠,٢ | ٤,٠ |
| ١٩٧٧ | ٣٢٩١ | ١٦٨٨ | ١٤٤٤ | ١١٧ | ٢٧ | ٢ | ١٣ |
| | ١٠٠,٠ | ٥١,٣ | ٤٣,٩ | ٣,٥ | ٠,٨ | ٠,١ | ٠,٤ |
| ١٩٨٧ | ٤٣٨٧ | ٢٢,٢ | ١٩٧٨ | ١٤٥ | ٣١ | ؟ | ٣١ |
| | ١٠٠,٠ | ٥٠,٢ | ٤٥,١ | ٣,٣ | ٠,٧ | - | ٠,٧ |

**کورد:** بە ژمارە و بە ڕێژە گـەورەترین نەتـەوەی باشـووری کوردسـتانە، بـەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەردەوام ڕێژەکـەی لـە کـەمبوون دایـە. لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٩٥٧-١٩٨٧، کەمبونەوەکە بریتـی بـوو لـە ٤,٨٪. هۆیـەکانی (جگـە لـەو هۆیانەی پێشووتر ئاماژەمان بۆ کرد) بۆ پرۆسیسی عارەباندن دەگەڕێتەوە. لێرەدا کەمێ بە درێژی لەم خاڵە دەدەوێین.

ئـەم پرۆسێـسە لـەرووی سـاڵی جێبـەجێکردن و شـێوە و پلـەی توندوتیـژی و بەرفراوانی و پارەخەرجکردن و هەڵوێستی رامیاری دەوڵـەتی عێراقـەوە، بەسـەر چەند قۆناغێکدا دابەش دەکەین:

## قۆناغی یەکەم (١٩٢١-١٩٦٣)

بە عارەبکردنی باشووری کوردستان لەلایەن دەوڵەتی عێراقی داگیرکەرەوە پرۆسیسێکی کۆنە، رەگە مێژوویەکەی بۆ سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، ساڵی ١٩٢٥ دەگەڕێتەوە،. ئەم بەرنامەیە، لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکان لە ناوچە جیاجیاکانی باشووری ئەم بەشەی کوردستان دەستیپێکرد، بەتایبەتی لە ناحیەکانی مەنسوریە و جەلەولا و سەعدیە و بەدرە، دواتریش لەقەزای حەویجە، ئەویش بەبیانوی کردنەوەی پرۆژەی کشتوکاڵی حەویجە، بۆ بە عارەبکردنی باشووری رۆژئاوای ئەستانی کەرکوك و نیشتەجێکردنی خێڵە دەشتەکییەکانی عارەب بوو. هەر لەم قۆناغەدا عێراق بە بیانوی نزیکی و بۆ ئاسانکردنی هاتووچۆ، لەساڵی ١٩٤٥ دا ویستی دەشتی قەراج (سەنتەری مەخمور، ناحیەی گوێر، ناحیەی قەراج) بەقەزای شەرقاتی سەر بە ئەستانی موسڵ (نەینەوا) بلکێنێ، بەڵام ئەمەی بۆ نەچووە سەر، لەبەر ئەوەی دەنگی نارەزایەکی زۆر لە هەموو لایەکەوە بەرزبۆوە[٢].

## قۆناغی دووەم (١٩٦٣-١٩٦٨)

لەم قۆناغەدا عێراق گەلێ پلانی بۆ بەعرەبکردنی باشووری کوردستان دانا، بەتایبەتی هەوڵێکی زۆری بۆ دابینکردنی ناوچە نەوتییەکانی وەك کەرکوك و خانەقیندا، پلانەکانیان زۆر بەخێرایی جێبەجێ دەکرد و ئەو جۆرە عارەباندنە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٣ کرا، بە درێژای هەموو قۆناغی پێشوو نەکرا بوو، ئەویش زیاتر بەبیانوی پاراستنی باری ئاسایشی شاری کەرکوك و نێوچە

نەوتییەکانی دیکە، بۆیە هەر زوو کەوتە روخاندنی هەزاران خانووی ماڵە کوردەکانی کەرەگەکانی شۆریجەو ئازادی لەنێو شاری کەرکوکدا. هەروەها ۲۱ گوندی لەنێوان ناحیەی دووبز- کەرکوك راگوێزایەوە ( عەولافات، پەلکانە، سەربەشاخ، بیرەبات...هتد )، زیاتر لە (۱۵۰۰) خێزانی جووتیاری گوندەکانی (مامە، عەلا غێر، شیرناو، قەرەدەرە، عەمشە، قوتان، قەرەهەیبەت، جوان، قوشقایە، کتکە، شانەشین، مەلا عەبدوللا) و چەندین گوندی دیکەش دەربەدەر کران و تیرە و هۆزی عارەبیان لە شوێن نیشتەجێ کران.

## قۆناغی سێیەم ( ۱۹٦۸- ۱۹۷۱)

دەکرێ ئەم قۆناغە بە قۆناغی راگرتنی بە عارەبکردنی باشووری کوردستان دابنێین، لەلایەکەوە بەعسیەکان تازە دەسەلاتیان بەدەستەوە گرتبوو، زیاتر خەریکی چەسپاندنی دەسەلاتی رامیاری و پایەی دەولەتی خۆیان بوون، پروپاگەندەیان دەکرد کە گوایە کە کێشەی گەلی باشووری کوردستانیش چارەسەر دەکەن، ئەوەبوو لە کۆتاییدا، رێکەوتنامەی ۱۱ی ئازاری ۱۹۷۰یان لەگەڵ سەرکردایەتی ئەو کاتەی شۆرشی کوردستاندا مۆر کرد. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، کەمو زۆر دەستیان لە بەعرەبکردنی هەندێ ناوچەی ستراتیژی هەڵنەگرت، بەبەهانەی پاراستنی هێمنی و ئاسایشی ئەو ناوچانە بەتایبەتی شاری کەرکوك و دەوروبەری.

## قۆناغی چوارەم (۱۹۷۲-۱۹۸۸)

ئەم قۆناغە بەگەورەترین و پڕ مەترسیترین قۆناغی بەعارەبکردنی ناوچە جیاوازەکانی باشووری کوردستان دادەنرێ، بەرنامەی عارەباندن لە قەزای کەرکوکدا بەشێوەیەکی گشتی و لەنێو شاری کەرکودا بەتایبەتی زۆر بەخێرایی جێبەجێ دەکرا، هەر ئەوندە بەسە کە بلێین، لەساڵی ۱۹۷۲ و بەرەو ژوور ۸۰-

١٠٠ هەزار عارەب بۆ شاری کەرکوك هێنران، کە لەدواییدا بەدرێژی لەم باسە دەدوێین.

ئەستانی سلێمانی، بەگوێرەی ڕێژەی کورد بۆ کۆی گشتی گشت دانیشتوان، لەبەرایی گشت بەشە ئیداریەکانە، ئەم ڕێژەیە لەساڵی ١٩٧٧ دا لە دەوروبەری ٩٤٪ (١٩٥٧-٩٨٪، ١٩٦٥-٨٦٪) لەدواییدا هەولێر دێ — ٨٦ ٪ (١٩٥٧-٨٩٪، ١٩٦٥- ٨٥٪)، ئینجا دهۆك— ٧٦٪(١٩٦٥-٧٩٪) پاشان کەرکوك دێ— ٣٨ ٪ (١٩٥٧- ٤٨٪، ١٩٦٥-٣٦٪)، لەدوای هەموویانەوە نەینەوا — ١٣٪ (١٩٥٧- ٢٢٪، ١٩٦٥-٢٨٪).

جیاوازی لە نێوان بەرزترین و نزمترین ڕێژەی چڕی دانیشتوانی کورد، لە قەزاکاندا لە ٩٩٪ تێدەپەڕێ. دانیشتوانی پشدەر ساڵی ١٩٧٧، گشتیان کورد بوون، لەهەمان کاتدا بەشێکی یەکجار زۆر کەم لەدانیشتوانی قەزای بەدرە بە کورد ناونوس کراون.

**عارەب** بەگەرەترین کەمینە نەتەوەیی باشووری کوردستان دادەنرێ، ئەم نەتەوەیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕێژەیان لە باشووری کوردستاندا زیادیکردووە. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٧-١٩٧٧ لە ٣٠٪ بۆ ٤٤٪ بۆ کۆی گشتی دانیشتوان، واتە زیادبوونە کە ١٤٪ بووە.

بەرزترین ڕێژەی عارەب لە ئەستانی نەینەوا دایە، لەساڵی ١٩٧٧ کەمێك زیاتر بوو لە ٨٥٪(١٩٥٧- ٧٠٪، ١٩٦٥-٦١٪). ئەمەش لەئەنجامی کۆچکردنی دەرەوە بۆ نێو شاری موسڵ بووە، کە زۆربەیان بریتیبوون لە عارەب، وەك نیشتەجێبوونی عارەبە دەشتەکیەکانی (بەدو) ناوچەی جەزیرەی عێراقی، ناونووسکردنی ژمارەیەکی زۆر لە خێزانی کورد و کەمە نەتەوەییەکانی دیکە (ئاسوری، کلدانی و ئەرمەن) بە عارەب. سەرچاوە مێژوویەکان نیشانی دەدەن،

که زۆربەی دانیشتوانی شاری موسڵ تا سەرەتای چەرخی هەژدەیەم لە کورد پێکهاتبوون و زمانی قسەکردن لە ماڵ و بازاڕدا هەمان شت بووە[٣].

ئەستانی کەرکوك بەرێژەی عارەب لە دوای ئەستانی نەینەوا دێ. لەساڵی ١٩٧٧ دا لەسەروو ٤٤٪ ی کۆی گشتی دانیشتوانەوە بوون ( ١٩٥٧-٢٨٪، ١٩٦٥-٣٩٪).

پێکهاتەی نەتەوەیی نێو شاری کەرکوك بەتایبەتی و ئەستانەکە بەگشتی، تا ساڵی ١٩٨٧ بەلای عارەبدا نەشکاوەتەوە. هەر چەند بۆ دواوە بگەڕێیەنەوە، ئەوەندە زیاتر بۆمان دەردەکەوێ کە عارەب لەو شارەی کوردستاندا، لە کەمینەیەکی نەتەوەیی بچوك زیاتر نەبوون، رێژەیان بەبەراورد لەگەڵ سەرجەم دانیشتوانی، لە ژمارەی پەنجەکانی دەست کەمتر بووە. بۆ نموونە، لەکۆتایی سەدەی نۆزدە دا، نووسەرێك دەربارەی کەرکوك نووسیویەتی (شاری کەرکوك ناوەندی ئەو لیوایەیە کە پێی دەڵێن شارەزوور و دەکەوێتە ولایەتی موسڵ لەکوردستاندا، سێ چارەکی دانیشتوانی کوردن و چارەکەکەی دیکەیان تورك و عارەبن و شتی ترن)[٤].

عێراق لەپێناو گۆڕینی پێکهاتەی نەتەوەیی و داشکانی بەلای عارەبدا ئەم هەنگاوانەی هاویشتووە[٥]:

١- گواستنەوەی هەموو فەرمانبەرە کوردو تورکمان و تورکەکانی کەرکوك لە دایەرەی (سجلی مەدەنی کەرکوك) بۆ شارەکانی دیکەی باشووری کوردستان و عێراق و هێنانی فەرمانبەری عارەب بۆ شوێنەکانیان. بەو شێوەیە تا بتوانن بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری (سجلاتی نفوس)ی دانیشتوانی شاری کەرکوك بکەن.

٢- هەموو ئەو فەرمانبەر و کرێکار و پۆلیسە کوردانەی کە لەسەر کێشەی کورد رایانکردبوو یان لەسەر کار دەرکرابوون، کە دەبوایە بەگوێرەی رێکەوتنەکەی ١١ی ئازار، بۆ سەر کاروباری خۆیان بگەرانایەتەوە. بەڵام بەعس

ڕێگەیان بەوانەی کەرکوك نەدا کە بۆ شوێنەکانی خۆیان بگەڕێنەوە، بەڵکو هەر یەکەیان بۆ شارو شارۆچکەکانی ئەستانی دیکەی باشووری کوردستان گواسترانەوە.

٣- پاشانیش کەوتنە گواستنەوەی ژمارەیەکی زۆرتر لە فەرمانبەری دایەرە و کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، لە بەرامبەر ئەمەشدا، سەدان و بگرە هەزاران فەرمانبەر و کرێکاری عارەبیان هێنایە شوێنەکانیان.

٤- لە ساڵی ١٩٧٢، عێراق کەوتە هاندان و یارمەتیدانی بێ ئەندازەی چەندین دەرەبەگ و تیرە و هۆزی عارەب، بۆئەوەی زەویوزار و موڵکی جوتیارە کوردەکانی دەوروبەری کەرکوك بکڕن، لەهەمان کاتیشدا، دەرەبەگ و جوتیارە کوردەکانیشیان هاندەدا، بۆ ئەوەی زەوی و زار و موڵکەکانیان بە عارەبەکان بفرۆشن، تالە ئەنجامی ئەو پیلانە گەورەیەی کڕین و فرۆشتنەدا، بەسەدان خێزانی جوتیاری کورد لە ناوچەکانی داودە و کاکەیی بە پارە دەربەدەر کران و گوندەکانیشیان (حەشیشە، دەللسی گەورە، دەللسی بچوك، کۆمر، رەبعاوە، تەلە رەبعە، عەتشاه، تەل مەغار، ئەرغون، سێکانی، کەراکرە، کەریمە، سەی محەمەد) عارەبنشین کران، ئینجا پارەیەکی زۆر و خانووبەرەیەکی زۆری نوێیان بۆ ئەو تیرە و هۆزە عارەبانە دروستکرد، هەم بۆ ئەوەی لە لایەکەوە بتوانن بە ئاسودەیی بژین، لەلایەکی ترەوە هاندەرێکی گەورە بێت بۆ هێنانی خێزانی دیکەی عارەب.

٥- راکێشانی جادەی شەست مەتری و دەست بەسەراگرتنی خانووی خێزانە کوردەکانی شۆریجە، دوای ئەوەی خانووەکانیان دەروخاندن و تەعویزێکی کەمیان دەدانێ و ڕێگەیان پێ نەدەدان لە ناو شاری کەرکوکدا زەوی بکڕن و جارێکی تر خانووی تێدا دروست بکەنەوە، ئەویش بۆ ئەوەی دەربەدەری شارەکانی دیکەی باشووری کوردستان و عێراق بن.

٦- کردنەوەی پرۆژەی کبریت و کارگەی کۆکاکۆلا لەشاری کەرکوك و هێنانی کرێکاروفەرمانبەری عارەب بۆیان و فەرامۆشکردنی کرێکارە کوردو تورکمانەکان. هەر یەکێکیش لەو کرێکار و فەرمانبەرانە، یا هەر یەکێك لەو خێزانە عارەبانە،(دەفتەر نفوس) ی ساڵی ١٩٥٧یان بۆ دەرهێنان، گوایە هەر لەکۆنەوە لە دانیشتوانی رەسەنی شاری کەرکوکن.

٧- قەدەغەکردنی کڕینی زەوی و خانووو، خانوودروستکردن لەهەموو ناوچەکانی کوردی دانیشتوانی کەرکوك و دەوروبەریشی و دەستگرتن بەسەر هەموو خانووو وموڵك ومالّی ئەو کوردانەی کە پەیوەندیان بە شۆڕشی کوردستانەوە کردبوو، یان لەترسی زەبروزەنگی دەزگا تۆقێنەرەکانی دەوڵەتی عێراقی و بوون بە بەعسی و جیشی شەعبی و رایان کردبوو، لە دوایشدا لەسەر ئەو عارەبانە تاپۆ کران کە بەمەبەستی بەعارەبکردنی ناوچەکە هێنرابوون و لە ماڵەکانیشیاندا نیشتەجێکران.

٨- دایەرەو کارگەکانی دەوڵەت ئاگادارکرابوون لەوەی کە هیچ فەرمانبەر و کرێکارێکی کورد بۆی نییە خۆی نەقڵی کەرکوك بکا، ئەو کوردانەش کە دەیانەوێ کەرکوك بەجێ بهێڵن و نەقڵی شارەکانی دیکەی باشووری کوردستان و عێراق بن، پاداشتیان لەلایەن دەوڵەتەوە دەدرێتێ.

٩- گۆڕینی ناوە کۆنەکانی شوێنەواەرکانی شاری کەرکوك، وەك شەقام و گەڕەك و کۆگە و قوتابخانە و گۆڕەپانە کوردی و تورکییەکان بۆ سەر ناوی عارەبی. گەڕەکی رەحیماوایان کردووە بە حەی ئەندەلوس، ناوی قوتابخانەی ئاسۆیان گۆڕیووە بە تەلیعە، ئامادەیی کوردستانیان کردووە بە عەبدول مەلیکی کوڕی مەروان.

١٠- دروستکردنی گەڕەکی تایبەتی بە شێوەیەکی بەرفراوان لەسنووری شارەوانی کەرکوکدا. نەخشەکێشانی گەرەکی کەرامە ( حی الکرامە ). لەساڵی

١٩٧٠ دا و جێبەجێکردنی زۆر بەزوویی، لە دەستپێکردندا دروستکردنی (٦٠٠) خانووو لە جێگایەکی گرنگ و ستراتیجی - باکووری رۆژهەڵاتی شاری کەرکوک - بەرامبەر گەرەکی ئیسکانی تازە لەسەر جادەی کەرکوک- سلێمانی، ئەوەی شایەنی باسیشە ئۆردوگایەکی تایبەتی سەربازی تەنیا (٣٠٠) مەتر، لەسەرووی گەرەکی کەرامەوە دروست کرا. لە ساڵی ١٩٧١ یشدا لەدووری یەك کیلۆمەتر لەگەرەکی کەرامەوە، بەلای باکوورو لە نێوان گەرەکی ئیسکانی کۆنەوە تا ئازادی، نەخشەی گەڕەکی موسەنا (حی المثنی) یان کێشا کە (٥٠٠) خانووو بوو، وە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٢ دا و لە دەستپێکردندا ساڵی ١٩٧٣ دا نەخشەکە جێبەجێکرا. لەنێوان گەڕەکی کەرامە و گەڕەکی موسەنادا، زیاتر لە (٢٠٠) پارچە زەویان لە ساڵی ١٩٨٠-١٩٨١ەوە بەناوی شەهیدانی قادسیەی سەدامەوە، بەسەر عارەبەکاندا دابەشکرد، کە لەدواییدا هەموویان کران بە خانووو. لەبەرامبەر رەحیماواشدا کە ئێستا ناویان ناوە گەرەکی ئەندەلوس گەرەکێك بۆ کرێکارانی کارگەی کۆلا دروست کرد. لەلای کەرکوکی نوێشەوە، کە دەکەوێتە رۆژئاوای شارەوە پرۆژەی دوو هەزار خانووو بۆ چوار هەزار لەلایەن مقاوەلاتی کەرتی تایبەتەوە بە جێهێنراوە، دووەمیشیان لەلایەن کۆمپانیایەکی بیانیەوە بەجێهێنراوە.

لەو بەری عەرەفەوە، واتە بەلای باشووری رۆژئاواوە، جادەی کەرکوک- دووبز، بەو بەری جادەکەوە بارەگاکانی (تیپی دوو، فەیلەقی یەك، فرۆکەخانە) لێیە کە بەرەو باشووری کەرکوك دەکشێ. جا لەم بەرو ئەو بەری جادەی کەرکوك- دووبز، زیاتر لە (١٠٠٠) خانووو دروستکراوە بۆ کرێکارنی کارگەکانی غاز و کبریت و پالاوتنی نەوت، کەپێیان دەوترێت (خانووەکانی عەمەل شەعبی)، ئەو کرێکارە عەربانەیان تێدا نیشتەجێ کردووە کە لە شوێنی کرێکارە کوردە نەقلکراوەکان دامەزراون لەو کارگانەدا.

هەر لەسەر هەمان جادەدا کۆمەڵە خانوویەکی تر بەناوی (حی الضباط) لەبەردەم ئۆردوگا سەربازییەکەی کەرکوك و گۆرەپانی فرۆکەخانەوە دروستکراوە، بە شێوەیەکی کەوانەیی بەرەوە هێڵی شەمەندەفەر درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە ئاستی (مەحەتەی کەرکوك). تەنانەت لەنێوان (باب النظام)ی فرۆکەخانە و (باب النظام)ی تیپی دوو، ئەو ماڵانەی تێکەڵی ئۆردوگاکە دەبن و سنوورىيان لە نێواندا نامێنێ کە ژمارەی ماڵەکانیش لە (٥٠٠) خانوو زیاترە. لە نێوان ئۆردوگای کەرکوك و ئێستگەی شەمەندەفەرەوە تا دەگاتە تسعینی کۆن و جادەی کبریت، ئنجا بەرەو جادەی کەرکوك –بەغدا و ئێستگەی تەلەفزیۆن، لەوێشەوە بەرەو خاسە چەندین گەڕەکی دیکە دروستکراون کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

زیاتر لە (٦٠٠) خانوو لەتسعینی کۆن بەناوی (حی البعث) دروستکراوە و عارەبی لێ نیشتەجێکراوە. لە نێوان جادەی بەغدا- تکریت، بەرلەوەی بگەیتە ئێستگەی تەلەفزیۆن زیاتر لە (١٥٠٠) خانوو بەناوی (حی الواسطي) دروستکراوە. هەر لەهەمان ناوچەدا زیاتر لە (٤٥٠) خانوو بە ناوی (دور السكك) دروستکراوە، لەسەر جادەی بەغداش زیاتر لە (١٠٠) خانوویان دروستکردووە بەناوی (حی الاشتراكية)وە، بە دەستە چەپی جادەی بەغدا، لەنێوان جادەو خاسەدا، زیاتر لە (١٦٠٠) خانوویان بەناوی (حی الغرناطة) وە، دروستکردووە و بەرەو تسعینی تازە هەڵدەکشێ.

لە دیوی خاسەشەوە، واتە لە ئاستی ئێستگەی تەلەفزیۆن و لە باشووری شارەکەوە بەرەو محەتە و مەجزەرە ( قەسابخانەی تازە) دەگاتە ڕێگای لەیلان - شۆریجە، چەندین ئێستگەی جۆربەجۆر و فراوانیان دروست کردووە و نەخشەی چەندین پرۆژەی دیکەشیان داڕشتووە. ئەو گەڕەکانە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە نزیکی (حی الكرامه)، ئەو گەڕەکە عارەبنشینانەش بریتین لەم گەرەکانەی خوارەوە:

* لەسەر ڕێگای لەیلان زیاتر لە (١٠٠٠) خانوویان بەناوی (حی الحجاج)ەوە دروست کردووە.

* لە نێوان قەسابخانەی تازە و (حی الحجاج)دا، (١٥٠٠) خانوویان بەناوی (حی العروبە) ەوە دروستکردووە.

* هەر لەهەمان ناوچەدا و لەسەرووی (حی الحجاج ) ەوە (٣٠٠) خانوویان بە ناوی (حی الوحدە) ەوە دروستکردووە.

* بەرامبەر (حی الوحدە) و سەیتەرەی لەیلان (١٥٠) خانوویان بەناوی (حی الحریە) ەوە دروستکردووە.

* ئینجا لە (حی العروبە) ەوە بەرەو شۆڕیجە (٢٣٠) ماڵی عارەبنشین هەن کە هەموو پیاوەکانیان سەر بە دایەرەی دەوڵەتی عێراقن، بۆیە ئەو خانووانەیان ناوناوە بە (دور الامن).

* لە(دور الامن) ەوە بەرەو خوارتر (١٠) خانوو بەناوی (دور ضباط الصف) دروستکراوە، بەردەمی ئەم کۆمەڵە خانووەش خێمەی تایبەتی هەیە بۆ پارێزگاری کردنیان.

* لەبەرامبەر (دور الامن) و (دور ضباط الصف) بەرەو خوار (٧٥٠) خانوویان بەناوی (حی القتیبە) دروست کردووە.

* لە (حی القبیة) بەرەو خوار (حی الشرطة) دەست پێدەکات، کە ژمارەی خانووەکان دەگاتە (١٠٠٠) خانووو.

* لە هاوینی ساڵی ١٩٨١ یشدا وەك وەجبەی یەکەم لە پشت سەیتەرەکەی لەیلانەوە زیاتر لە (٨٠٠٠) پارچە زەوییان بەسەر عارەبە تازە هاتووەکاندا دابەشکرد، لەگەڵ پێشکەشکردنی یارمەتیەکی ١٩ هەزار دیناریدا، واتە ١٠ هەزار دینار منحە و ٦ هەزار دینار عەقاری و ٣ هەزار دیناریش بۆ دروستکردنی ژێرزەمین. لەوەجبەی دووەمیشدا ٢٥ هەزار پارچە زەوی دیکەیان

دابەشکرد، کە ئەمەیان درێژەکەی ١٨ کیلۆمەتر دەبێ و تادەگاتە ناحیەی لەیلان.

١١- جێبەجێکردنی چەندین پرۆژەی جۆراوجۆر لەناو جەرگەی شاردا، بەتایبەتی لەناو گەڕەکە کوردەکاندا. لە نێوان موسەڵاو قەسابخانەی کۆندا (٤٠٠) شوقەیان بەسەر ماڵە عارەبەکاندا دابەشکرد، هەر ماڵێکیش ١٠ هەزار دیناریان داوەتێ، بەمەرجێ ئەوەی شوێنی ناونووس و جێگای لە دایکبوونی خۆی بگۆرێتە سەر کەرکوك. لە گەڕەکی ئیمامقاسمیشدا (٢٠٠) پارچە زەوییان بەسەر ماڵە عارەبەکاندا دابەشکرد و کردویانە بە خانووی، ناویشیان لێناوە (حی البعث).

١٢- روخاندنی گەڕەکە میللیەکان بەتایبەتی گەڕەکە کوردیەکان کە بەناوی ئاوەدانکردنەوەوپەرەپێدان و نەخشاندنی شارستانیەتی شارەکە و کردنەوەی رێگەوبانی تازە و دامەزراندنی پرۆژەی جۆراوجۆری دایەری ئاسایش و رێکخراوی بەعس. پانکردنی هێڵی شەمەندەفەری کەرکوك- هەولێر و پرۆژەی پردی تەپە- زێویە، سەدان ماڵیان رووخاند و بەبلدۆزەر لەگەڵ زەویدا تەختیانکرد.

١٣- گۆڕینی نەخشەی ئیداری ئەستانی کەرکوك: دابرینی قەزای توزخورماتوو بەهەر چوار ناحیەکەیەوە (قادر کەرەم، نەوجول، سلێمان بەگ، ئامرلی) و لکاندنی بە ئەستانی تکریت، دابڕینی قەزای کفری بەهەموو ناحیەکانیەوە لەکەرکوك و بەستنەوەی بە ئەستانی دیالەوە.

بەم جۆرە دەبینین، شاری کەرکوك سەرباری رووخاندنی هەزاران ماڵی کورد و دەربەدەرکردنی دانیشتوانەکەی بە پشتێنەیەکی (٢٠٠٠٠) لە دواکەتوترین ماڵە عارەب بە رەبایە و ئۆردوگای سەربازی ئابلۆقە دراوە. ئەگەر تێکڕای سەرژمێری هەر ماڵێك بە ٤ تا ٥ کەس دابنێین، ئەوا سەرژمێری ئەو عارەبانەی لە ئەستانی

کەرکوکدا نیشتەجێکراون، دەگاتە ٨٠ تا ١٠٠ هەزار عـارەب، کەبەشـی هـەرە زۆریان لە ئەفسەر و پۆلیس و سیخوڕ و ئیستیخبارات و مخابەرات و کەسانی سەر بەپارتی بەعس و کارگێڕانی تایبـەتی ئـیش و کارەکـانی خۆیـان وە دایـەرەکان پێکهاتوون.

**تورکمان:** لەرووی ژمـارەو رێـژەوە، تورکمـان بـەدووەمین نەتـەوەیی باشـووری کوردستان دادەنرێن، رێژەیان وەك کورد بـەردەوام لەکەمبونـەوە دایـە. تورکمـان ساڵی ١٩٥٧ زیاتر لە ٦٪ ی گشت دانیشتوانیان پێکـدەهێنا و سـاڵی ١٩٧٧- ٣,٥٪، واتە لە ٢٠ ساڵی دوایدا ٢,٧٪ یـان کـەم کـردووە. هۆکەشـی بەپلـەی یەکـەم بـۆ پـۆلێتیکی بـەعارەبکردن دەگەڕێتـەوە، کـە تارادەیـەك ئەمانیـشی گرتۆتەوە.

زۆربەی تورکمانەکان لە ئەستانی کەرکوك دەژین، ڕێژەیان لـە سـاڵی ١٩٧٧دا کەمێك لەسەروو ١٦٪ گشت دانیشتوان بوون (١٩٥٧- ٢١٪). لەهەمان ساڵدا رێژەیان لە ئەستانی هەولێر ١,٦٪ بوو، زۆربەیان لەشاری هەولێر دەژین، رێژەیان ناگاتە ١٪ لەیەکە ئیداریەکانی دیکە.

جێگای بنـەڕەتی مۆڵـدانیان، قـەزای کەرکوکـە، بەتایبـەتی شـاری کـەرکوك (١٩٪) قەزای توزخورماتوو (١٨٪)، قەزای دووبـز (٩٪)، قـەزای کفـری ٦٪) قەزای خانەقین (٤٪)، قەزای هەولێر بەپلەی یەکەم لەناو شارەکە (٣٪)، قەزای حەمدانیە (٣٪)...هتد.

**سریان:** کەمـە نەتـەوەیی سـریانی (ئاسـوری، کلـدانی)، بەشـێکی کـەم لـە دانیشتوانی باشووری کوردستان پێکدەهێنن و رێژەیان لە سـاڵی ١٩٧٧ لـە ١٪ کەمتر و (١٩٥٧- ١,٩٪، ١٩٦٥- ١,٧٪). ئەستانی دهۆك (١٩٧٧- ٤,٦٪) و هەولێر (١,٦٪) کەبە گەورەترین شوێنی مۆڵدانیان دادەنرێ.

ئەو ناوەندە كۆنانەی كە زۆربەی سریانیەكانی تێدا كۆدەبنەوە، بریتین لە قەزای ئامێدی (٧٪)، دهۆك (٥٪)، شـەقلاوە (٤٪)، هـەولێر (٢٪)، زاخـۆ (١٪) و تاڕادەیەكیش رواندز.

**ئەرمەن:** ژمارەیەكی زۆر كەم لە ئەرمەنییەكان لە باشووی كوردسـتان دەژیـن، لە هیچ كام لەو سـەرژمێریە گـشتیانەی كـە كـراوە، رێـژەیان لـە ١٪ی كـۆی دانیشتوانی گشتی تێپەر نەكردووە. شوێنی هەرە گرنگی ژیانیان قەزای زاخۆیـە (١٩٧٧- نزیكـەی ١٪)، دانیـشتوانی گونـدەكانی ئافزوریـك وهەوریـسك، لـە سەردەمێكدا بەگشتی لە ئەرمەنەكان بوون[٦].

**نەزاندراو:** ژمارەی نەزاندراو لە نێو دانیـشتوانی باشـووری كوردسـتاندا، لـە سالّی ١٩٧٧ دا نزیكەی ١٣ هەزار كەس بوون. ئەمانە یـا بەدەسـتی ئانقەسـت پێناسـەی نەتـەوەیی خۆیـان ئاشـكرا نـەكردووە، ئـەویش لەترسـی ئـازاردان و گیروگرفت دروستكردنەوە بۆیان و فەرامۆشكردنی پێناسەی نەتەوەییان بەدەسـتی ئانقەست لەلایەن عێراقەوە، یاخود لەبەر هەر هۆیەكی دیكە بێ، ئەگینا ئەزلـەو بروایەدا نیم، ئەو هەموو كەسە پێناسەی نەتەوەیی خۆیان بزر كردبێ.

**دووەم: پێکهاتنی ئایینی**

پێکهاتنی ئایینی لە باشووری کوردستاندا هەروەکو پێکهاتنی نەتەوەیی گەلێ ئالۆزە. لەم ولاتە پەیرەوانی زۆربەی ئاینە رۆژهەلاتیەکانی تێدایە، جگە لە ژمارەیەك لە تەریقەت و رێبازی سۆفییەت.

ئەوەی لێرەدا پێویستە بەرچاو بخرێ، نەبوونی ژمارەی تازە و سەرژمێری نەك هەر یەکێ لەو ئایینزایانە یە، بەلکو بۆ ئایینە سەرەکیەکانیش. ئەمەش بۆ وەستانی لە بلاوکردنەوەی ئاماری پێکهاتنی ئایینی دانیشتوان دەگەرێتەوە. لەدوای سەرژمێری ١٩٦٥زاینی و حسابکردنی پەیرەوانی هەندێ ئاینی خۆجێی بە ئیسلام و ئاشکرانەکردنی بروای بەدلّ و دەروون لەترسی ئەشکەنجەو ئازاردان و بەشێوەیەکی گشتی لە باشووری کوردستاندا ئەم چەند ئاینەی لای خوارەوە بلاوە:

**ئیسلام:** ئیسلام تازەترین ئایینی دانیشتوانی ئەم ولاتەیە، کە پەیدابوونی بۆ نیوەی یەکەمی سەد سالّەی حەوتەمی زاینی دەگەرێتەوە. مێژوونوسەکان زۆربەیان لەسەر ئەو بروایەن، کە گوایە کوردستان بە بەشی باشووریەوە، بەخۆشی و بێجەنگ و داگیرکردن، ئەم ئایینە نوێیەیان پەسەندکردووە، بەلام بەگوێرەی نووسینی مێژوونوسانی سەرەتای دەرکەوتنی بیروباوەری ئایینی ئیسلام خۆیان و بگرە مێژوونوسانی ئەم دواییەش، خەلّکی کوردستان زۆر راپەرینی خوێناویان دژی سوپای داگیرکەری عارەب بەرپا کردووە و ئامادە نەبوون بە خۆشی خۆیان دەست لە بیروباوەری تایبەتی ئاینی خۆیان هەلگرن. تاکوئێستاش لە چەندین شوێنی کوردستاندا، شوێنەواری ئەم جەنگانە لە یادی خەلّکیدا هەر بەزیندوویی ماون. عارەبە موسلّمانەکان بۆ سەپاندنی ئاینی تازەی خۆیان لە هیچ کارێکی نارەوا دەستایان نەگێراوەتەوە. بۆ نموونە لە سالّی ٦٣٩ی زاینیدا لە شارەزوور سێ شەو و سێ رۆژ، دەستیان لە کوشتن و برین هەلّنەگرتووە بە هەزاران کەسیان کوشتووە[٧]. تەنیا لەبەر ئەوەی خەلّکی ئەو ناوچەیە ئامادە نەبوون بێنە ناو جوغزی ئایینی نوێوە.

زۆربەی زۆری دانیشتوانی باشووری کوردستان بە ئاین ئیسلامن. لە سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٨٧دا ڕێژەی ئیسلام بە ٩٣٪ی کۆی دانیشتوان دەخەملێنرێ، (١٩٦٥-٩٢٪)، ئەم ڕێژەیە لەهەموو ئەستانەکاندا وەکو یەك نییە، بۆ نموونە: ڕێژەی موسوڵمان لە ئەستانی هەولێر دەگاتە ٩٨٪، سلێمانی و کەرکوك- ٩٢٪ لە دهۆك- ٨٦٪ و لە نەینەوا- ٩٤٪ لەکۆی گشت دانیشتوان.

موسوڵمانان لەسەر مردن و شوێنی شاردنەوەی پێغەمبەر لە (مەکە) یا لە (مەدینە) هەموو یەك بڕوایان نییە، ئیمامەتی و میراتی پێغەمبەر دوای خۆی کێ بیگرێتە ئەستۆ و هەڵوێست بەرامبەر کەسانێ کە زەکات نەدەن و کاروباری شوراو ڕووداوی سەردەمی ئەمیری ئیمانداران (ئیمامی عەلی) پاش پێکهاتن و پیرۆزباییکردن (بەیعە) و ناکۆکی لەگەڵ (معاویە)دا، لەبەر ئەم هۆیانە موسوڵمانان لە کوردستان و وولاتانی دیکەی جیهاندا بەسەر دوو بەشی سەرەکیدا دابەش دەکرێن:

أ- **سونە:** دانیشتوانی باشووری کوردستان، زۆربەیان سونییە. ڕێژەیان لەناو دانیشتوانی ئەستانی هەولێر و سلێمانی و نەینەوا، لەسەروو ٩٠٪ وەیە و لە کەرکوك و دهۆك و لە قەزایەکانی خانەقین و مەندەلی و بەدرە کەمێك کەمترن. سونە بریتییە لە ئاینزای شافعی، حەنەفی، مالیکی و حەنبەلی. هەر یەکێ لەم ئاینزایانە، پەیڕەوی تایبەتی خۆی هەیە، بەژمارە و پلەی بڵاوبونەوەی لەگەڵ ئەمەکەی تردا جیاوازە.

١- **شافیعی**- بەربڵاوترین ئاینزای سونی لە نێو خەڵکی باشووری کوردستاندا، ڕێژەیان لە هەموو یەکە ئیدارییەکان، لە ٩٠٪ زیاتر دەبێ و زۆربەی کورد لەسەر ئەو بیروباوەڕەن.

٢- **حەنەفی**- ئەم ئاینزایە لە نێو عارەبەکاندا زیاتر بلاوە وەك لەنێو کوردەکاندا. بە شێوەیەکی گشتی لە ناوچەکانی باشوور و باشووری رۆژهەلاتی کوردستاندا زۆر بلاوە، بەتایبەتی لە ئەستانی کەرکوك.

٣-**مالیکی**- زۆربەی پەیرەوانی ئەم ئاینزایە، لە بنەرەتدا دانیشتوانی باشووری کوردستان نین و پەیدابونیان بۆ سەرەتای عارەباندنی باشووری کوردستان دەگەڕێتەوە. بەتایبەتی بۆ سەرەتای شەستەکان. پەیڕەوانی ئاینزای مالیکی بەرەچەلەك عارەبن.

٤-**حەنبەلی**- تاسەرەتای حەفتاکان، حەنبەلی لە باشووری کوردستاندا بەدەگمەن هەبوون، بەلام لەو سالانە بەدواوە لە ئەنجامی گواستنەوە و هێنانی عارەب لە عێراقەوە و نیشتەجێکردنیان لە باشووری کوردستان، ژمارەیان بەردەوام لە زیادبوندا بووە.

لە باشووری کوردستاندا، گەلێ تەریقەتی سۆفێتی سەر بە تایەفەی سونە هەن، گرینگترینیان ئەمانەن:

**١- تەریقەی قادری**

دامەزرێنەری ئەم تەریقەیە شێخ عەبدولقادری گەیلانییە، دانیشتوانی گوندی گەیلانی ناوچەی کرماشان بووە. لە رێگەی عەبدولکەریمی گەیلانی نەوەی شیخ عەبدولقادر بە شوێنەکانی دیکەی کوردستاندا بلاوکراوەتەوە.

شێخەکانی قادری، بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی ناوەندی تایبەتی خۆیان و بگرە پایەی کۆمەلایەتیشیان، هەمیشە رەچەلەکی خۆیان بۆ سەر محەمەدی کوری عەبدوللا (پێغەمبەری ئیسلام و عەلی کوڕی ئەبو تالب (یەکێ لە چوار خەلیفەکانی راشیدی) دەگێڕنەوە، بەلام لەناو خۆیاندا لەسەر ئەم بیروباوەڕە یەك نین.

ئەورۆ تەریقەی قادری یەکێکە لە تەریقەتە بەربڵاوەکان و پەیڕەوکەرانیشی (دەروێش) لەزۆربەی ناوچەکانی باشووری کوردستاندا هەن، ئەمەش بۆ نزیکی لە ئاینزای سونە و شەریعەت و هەروەها ڕچەڵەکی شێخەکانیان کە زۆربەی کوردن دەگەڕێتەوە[٨].

### ٢- تەریقەی نەقشبەندی

ئەم تەریقەیە بەبۆچونی زۆربەی مێژوونووسان، ساڵی ١٨١١ لەلایەن شێخ زیائەدینی کوڕی خالیدی نەقشبەندی (مەولانا خالید) ەوە گەیشتۆتە شاری سلێمانی و هەر لێرەشەوە بە ناوچەکانی دیکەی کوردستاندا بڵاوبۆتەوە. هۆیەکانیشی بۆ هەڵوێستی جیاوازی لەگەڵ تەریقەی قادری سەبارەت بە کێشەی دەسەڵاتدارێتی میرانی بابان و فەرامۆش نەکردنی لایەنی دونیایی لە ژیانی مرۆڤدا لە پێناو ئاییندا دەگەڕێتەوە، بەواتایەکی دیکە، چۆن دینت دەوێ، پێویستە بەو شێوەیەش دونیات بوێ.

### ٣- تەریقەی ڕەفاعی

ژمارەیەکی کەم لە موسڵمانەکانی باشووری کوردستان، پەیڕەوی ئەم تەریقەتە دەکەن. ئەم تەریقەتە بەزۆری لە نێو تورکمانەکانی ئەستانی کەرکوك و شاری هەولێردا بڵاوە.

### ٤ - ڕێبازی هەقە

داهینەری ڕێبازی هەقە لە باشووری کوردستاندا، بەشێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە دادەنرێ، کە شێخی نەقشبەندی بوو لە قەزای سورداش. بۆیە شێخی ناوبراو (وەکو تەریقەیەکی ئاینی رووت وشك سەیری تەریقەتی نەقشبەندی نەکردووە، کە بەهۆیەوە بگات بە توانەوە لە خوا پەرستیدا، بەڵکو بەم شێوە و لە ڕێگەی ئەم ڕێبازەوە، ویستوویەتی ئامۆژگاری و پرەنسیپەکانی تەریقەتەکەی و

ڕێبازی ئاین بەگشتی لە بواری ژیانی کۆمەڵایەتیدا پیادە بکات و باوەڕ بە (یەکسانی) کە هەزاران ساڵ بوو ئیدیاڵی ئاین و ئاینزای شۆڕشگێرانی دونیا بوو، و هەر لەو پێناوەدا بۆی لەتێکۆشاندا بوون)[٩]. ڕێبازی هەقە لەسەردەمی مامە ڕەزادا توشی گەلێ بوژاندنەوەو سیسی بووەو شێخیش لە بەندیخانەدا گیراوە.

**ب- شیعە:** لەناو دانیشتوانی باشووری کوردستاندا، پەیرەوکەرانی تایەفەی شیعە هەن. بەڵام ڕێژەیان چوار جار لە چاو ڕێژەی سونەکاندا کەمترە (٢٠٪). زۆربەی شیعەکان لە ئەستانی کەرکوك (٨٪) و دهۆك (٥٪) و قەزایەکانی خانەقین و مەندەلی و بەدرە و توزخورماتوو و شوێنەکانی دیکە دەژین.

شیعەکانی باشووری کوردستان لە نێو خۆیاندا، بەسەر چەندین دەستەدا دابەش بوون، کەلەگەڵ یەکدیدا لەرووی بڕواو هەڵوێست لە ئیمامی عەلی و ژمارەی پەیرەوکەرانی، جیاوازیەکی کەمیان هەیە. گەورەترین ئاینزای شیعە لە باشووری کوردستاندا ئیمامیەیە (دوازدەیی) و بە پلەی یەکەم لەهەموو قەزایەکانی ئەستانی کەرکوکدا دەژین و لەنێو کورد و عارەب و تورکمانەکاندا بڵاوە.

**٢- مەسیحی**

ئاینی مەسیحی لە شاری ئۆرشەلیم سەری هەڵدا و یەکەم کڵێسەی لە هەمان شاردا دروستکرد، لەدواییدا لە ڕێگەی نێردراوەکانی عیساوە، بۆ قەزاکانی دیکەی فەلەستین تەشەنەی کرد. لە پاشتریش لەرێی هەمان کەسانەوە بە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتینیدا، وەك فینیقیا و قوبرس و شاری ئەنتاکیەدا بڵاوبۆتەوە. بەڵام دەربارەی بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە لە کوردستاندا و لە چ سەردەمێکدا بڵاوبۆتەوە، دوو بیروبۆچوون هەیە: یەکێکیان دەڵێ، لە ڕێگەی کەسانی پارسی و مادی و ئیلامی، کەلە سەدەی یەکەمی زاینی، بەمەبەستی زیارەتکردنی عیسا و بینینی کەرامەتەکانی، سەردانی ئۆرشەلیمیان کرد. گومان لەوەدا نییە ئەو کەسانە پاش گەڕانەوەیان، باسی ئەم پێغەمبەرەیان بۆ خەڵکی

ناوچەکە کردووە، بەڵام لەوە دەچێ کە کارێکی زۆریان نەکردبێتە سەر خەڵك بۆ ئەوەی لە بیروباوەری خۆیان واز بێنن و بچنە سەر ئەو ئایینە نوێیە. لەلایەکی تریشەوە نوێنەرەکان هیچ کامێکیان لەوانە نەبوون دەسەڵاتی فەرمانڕەوایان هەبوبێ و خەڵکیان ناچار کردبێ بۆئەوەی بێنە سەر ئاینی تازەی عیسا. بە پێی بۆچوونێکی دیکە، دەبێ لە ڕێگەی دانیشتوانی شاری روها (ئۆرفا) و ئەنتاکیە لەسەدەی سێیەمی زاینیدا بوبێ، خەڵکی ئەم دوو شارە بەردەوام و بەگەرمی بەمەبەستی بازرگانی هاتووچۆی یەکدیان دەکرد. دووریش نییە چەند کەسێکی دانیشتوانی ئەنتاکیە روویان لەشاری رۆها کردبێت و لێی نیشتەجێ بووبن. ئەم ڤێرسایە ڕێگای زیاتری تێدەچێ، چونکە لەلایەکەوە لەبەر کورتی مەودای نێوان شارەکان و لەلایەکی ترەوە گەیشتنی هەواڵی تازە لەمەر ئەم ئاینەوە. لەدواییدا بەرەبەرە بە ناوچەکانی دیکەی کوردستاندا بڵاوبوبێتەوە و لەزۆر لایەنەوە ئەبریشیە دروست کراوە، کەژمارەیان لەچارەکی یەکەمی سەدەی سێیەم لە ٢٠ زیاتر بوو لە هەموویان بەناوبانگتر حەدیاب (هەولێر)- یەکەم کڵێسە لە رۆژهەڵات- و بازیدی (سازخ) و کەرخ سلوخ (کەرکوك) و هەلوان و شەنگارو هی دیکە.

مەسیحیەکانی باشووری کوردستان، ئەگەر چی لەسەر تاقە خودایی و پێغەمبەرایەتی عیسا یەك بڕوان، بەڵام لەشیکردنەوەی کەسایەتی ئەم پیاوە بۆچونی جیاوازیان هەیە، کە ئەمەش بۆتە هۆی پەیدابوونی چەند ئاینزایەك و هەریەکێ لەو ئاینزایانە بەناوی داهێنەرەکەیەوە، ناوی رۆیشتووە، بەڵام لە هەموویان لەمێژینەتر و بەپەیڕەوانتر و بەدەسەڵاتر و بەربڵاوتر ئەمانەن:

أ- **نەستوری:** نەستور لەشاری مەرعەش (جەرمانیق)، باکووری رۆژئاوای کوردستان لە ساڵی ٣٧٨ی زاینیدا لە دایکبووە. پێش ئەوەی ببێتە پەترەریکی قوستەنتینیە، لەساڵی ٤٢٨دا، لەدێری ئۆبریبیۆسی ئەنتاکیە دەیخوێند، بەهۆشیاری و زیرەکی و کەرامات ناوی دەرکردبوو. لەکۆتایی سەدەی پێنجەمدا، بیروڕای خۆی بەرامبەر کەسایەتی عیسا بەم شێوەیە ڕاگەیاندووە: (خلاصتها

الاعتقاد باقنومين وطبيعتين في السيد المسيح. لذلك فهو مسيحان احدهما ابن اللة والاخر ابن الانسان. وان مريم لايجوز ان تدعى (والدة الله) بل ام المسيح).
بەڵام ئەم بۆچونەی نەستور، بەبڕوای ژمارەیەکی زۆر لە ئەسقۆفەکان لادان بوو لە ئاینی مەسیح.

لە ساڵی ٤٣٠ ی زاینییدا، بۆ دەربرینی پەشیمانی لە بۆچونەکەی بانگیان کرد، لەبەر ئامادە نەبوونی، ناچاربوون لە ساڵی ٤٣١ی زاینییدا، کۆبونەوەیەکی گەورەتر لە ئافسس بکەن. ئەم جارەشیان بانگهێشتەکەی پشت گوێخست و لە ئەنجامدا بڕیار دەرچوو بەقەدەغەکردنی ئامۆژگاریی بۆگەنەکانی نەستور و دوورخستنەوەی و سەرەونگومکردنی لەساڵی ٤٣٥ بۆ ئاودسا لە میسر. لەگەڵ ئەوەشدا بۆچونەکانی و ئامۆژگاریەکانی، نەك هەر کزنەبوو، بەڵکو لەناو خەڵکیدا گەشەیان سەندو هەتا ئەوڕۆکەش لایەنگرانی لەهەموو قوژبنێکی ئەم جیهانەدا هەن وبە (نەستوریی ئاسوری) ناوبانگیان دەرکردووە.

ب- یاقوبی (سوریانی ئارسیدۆکس): یاقوبی بەرداعی دامەزرێنەری ئاینزای یاقوبیە لە ئاینی مەسیحیدا و لە ساڵی ٥٧٨ی زاینیندا مردووە.یەکێك لەو دوو کەسە بووە، کە پەتریارکی قوستەنتینیە رەوانەی کوردستانی کردون بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری ئاینی و بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت لە کوردستاندا. ئەویش بەجوانترین شێوە کارەکەی خۆی بە ئەنجام گەیاندووە.

ئاینزای یاقوبی لەسەر ئەو بروایەن کە (فی المسیح طبیعتان متحدتان بدون تغیر ولا انفصال ولا امتزاج) بە واتایەکی تر (ان للمسیح طبیعة مرکبة واحدة وهي الهیة، وتتکون هذة الطبیعة المرکبة من طبیعتین الهیة وبشریة، لکن الاولی حوت الطبیعة الثانیة، فاصبحت الطبیعتان طبیعة واحدة کقطعة الزجاج المصنوع من الرمل والذی اصبح زجاجا ولم یعد الرمل). یاقوبیەکان لە زۆربەی ئاوەدانیەکانی باشووری کوردستان، بەتایبەتی کەرکوك هەن.

پ- ئاینزای کلدانی: کلدانییەکان لە شارۆچکەکانی عەنکاوە و شەقڵاوەی ئەستانی هەولێر دەژین. لە قەزا ئیدارییەکانی دیکەی باشووری کوردستان، ژمارەیان زۆر کەمە. لەڕووی ئاینییەوە، یاخود لەرووی هەڵوێستیان بەرامبەر کەسایەتی عیسا، لەگەڵ هاوئاینزاکەی دیکەیان (نەستوریەکان) جیاوازیەکی ئەتۆیان نییە.

## ٤- ئایینەکانی دیکەی باشووری کوردستان

دانیشتوانی باشووری کوردستان، جگە لە ئیسلام و مەسیحی لەسەر بڕوای ئێزیدی و ئەهلی هەق (کاکەیی) و سارەلی و گۆران و قەڵەم حاجی هی دیکەشن.

### ١-ئێزیدی

ئێزیدیەکان وەکو زۆربەی پسپۆڕ و نووسەران سەلماندویانە، بەڕەچەڵەك کوردن و لە ئاینەکەیاندا گەلێ توخمی ئاینەکانی زەردەشتی و جولەکەو مەسیحی و ئیسلامی تێدا هەیە. بەشی زۆری ئێزیدیەکانی باشووری کوردستان، لەقەزایەکانی شەنگار و شێخان و گوندەکانی دەوروبەریاندا دەژین، لەم ناوەدانیانە ڕێژەیان لەسەروو ٩٠٪ ی کۆی گشت دانیشتوانەوەیە.

ئێزیدییەکان بروایان بە هێزی خێر (ئاهۆرامازدا) و شەر (ئەهریمەن) هەیە. ئەم دوو هێزە لەململانێیەکی توند دان، کەلە دواییدا سەرکەوتن هەر بۆ یەکەم دەبێ. ئێزیدییەکان دوو کتێبی پیرۆزیان هەیە. یەکەمیان ناوی (جیلوە)یە، ئەوی تریان بە ناوی (مەسحەفا رەش). کۆمەڵگەی ئێزیدی لەمیر و پسمیروو بابەشێخ و شێخ پیر و نەفیرو قەواڵ و کوچەك و مورید پێك هاتووە، هەر یەکێ لەم چینانە تایبەتمەندی خۆیان هەیە و پارێزراویشە.

ئێزیدییەکان رۆژانە دوو جار نوێژ دەکەن، یەکێکیان لەبەرەبەیان و ئەوی دیکەیان لە خۆرئاوابوندا. دوو جۆر رۆژووگرتنیان هەیە، یەکێکیان گشتیە کە هەموویان دەیگرن و بەناوی (رۆژوگرتنی ئێزید) و ئەوی دیکەشیان (رۆژوگرتنی خدر ئەلیاسە) تایبەتی و تەنیا بۆ پیاوانی ئاینییە.

**٢- ئەهلی هەق (کاکەیی)**

ئەم کۆمەڵە ئیتنۆ- ئاینییە لە باشووری کوردستاندا، زیاتر بەکاکەیی ناسراون، ئەگەر چی ناوی راستەقینەیان ئەهلی هەقە و لەلای هەندێ پسپۆر و لێکۆڵەرەشەوە، زیاتر بە ناوی (عەلی ئیلاهی)یەوە ناویان دەرکردووە[١٠].

ئەهلی هەق بەزۆربەی ناوچەکەنی باشووری کوردستاندا بڵاوبونەتەوە، بەتایبەتی هەورامانی هۆن-چیای شنەروێ و گوندەکانی: هاوار، چاڵان، دەرەتوێ، ژاوەرۆ، لەدەوروبەری کەرکوکیشدا گوندەکانی: مەتیق، مەتراد، عەلی سەرا، جنگلاوە، هێب، زەنقر. گوندەکانی لای موسڵیش: مەتراد، سفەیە، تۆیلەبەن، هۆردەکی، کوڵەبۆر، گەزەکان و کەلەك. گوندەکانی خانەقینیش: مێخاس، شێخ رەحیم، پویکە، چەمچەقەڵ ...هتد.

پلەی ئایینی و کۆمەڵایەتیەکانی ئەهلی هەق (کاکەیی) ئەمانەن: سەید، خەلیفە، چاوەش، دەروێش، کەلام خوان. سێ پلەی یەکەم تایبەتی و میراتگرین. ئەهلی هەق، کاروباری ئاینییان بە هۆنراوە و پەخشان و بە زمانی جیاواز (کوردی- دیالێکتی گۆران، فارسی وئازەری) دەربریوە، بە بۆچوونی زۆر کەس، بەناوبانگترین و رەنگە پیرۆزترینیشیان، ئەو تێکستانە بێت، کە پێیان دەڵێن (سەرئەنجام).

**٣- شەبەکی**

ئاینێکی دیکەی دانیشتوانی باشووری کوردستانە. شەبەك بەرەگەز کوردن و زمانەکەیان کەمێك وشەی عارەبی و تورکی و هی دیکەی تێکەڵاوە. شەبەکەکان بروایان زۆر بەئیمامی عەلی قایمە. بەزۆری لە قەزایەکانی سەر بە ئەستانی

نەینەوا دەژین، بەتایبەتی دەروێشە، قەرەتەپە، باجەربوعە، خەزنەتەپە، منارەرەش، تەیراوا، تۆپزاوا، عەلی رەش، شەبەك، كارێزو...هتد[11]. ژمارەیان لە ١٦ هەزا كەس زیاترە.

## ٤- سارەلی

پەیڕەوكەرانی ئەم ئاینە، لە ئاوەدانیەكانی تەللبەنە، بەستەلیە، كەبەرلی، خەرابەسولْتانە و ئاوەدانی دیكەی سەر بە ئەستانی نەینەوا دەژین و خاوەنی ئاینی تایبەتی خۆیانن و بیروباوەڕیان نهێنیە. وەك بیستراوە، كتێبی پیرۆزیان بەزمانی فارسیە و شوێنی ئاینە كۆنەكانی ئێران و بیروبۆچوونی غولاتی شیعەكان، لە ئاینەكەیاندا دەبینرێ.

ئەم ئاینە بۆ ناوەكەیان، چەند فیرسیایەك هەیە، بەگوێرەی یەكێكیان گوایە خەڵك بەهەشتیان لە پیاوە ئاینییەكانیان دەكرێ و دەیانگوت (صارت لی جنة) واتە بەهەشت بووبەهی من[12] لەدوای ئەمە كورت كراوەتەوە بووە بە سارەلی.

## ٥- گۆران

لە ئەستانی دهۆك و بەتایبەتی لە قەزای زاخۆ، پەیڕەوانی ئەم ئایینە لە باشووری كوردستاندا دەژین. ئایینەكەیان لە چەند توخمێكی ئاینەكانی دیكە پێكهاتووە و ژمارەشیان چەند هەزار كەسێك دەبێ.

## سەرچاوە و پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

١- نووسەر لەم سەرچاوانەی تاوتوێ کردووە.
- الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتجيل عام ١٩٥٧، لوائى ديالى وكوت. مطبعة العانى- بغداد، ١٩٦١، لوائى السليمانية وكركوك، مطبعة العانى- بغداد، ١٩٦١. لوائى الموصل و اربيل، مطبعة الارشاد- بغداد، ١٩٦١.
- شاكر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالى دراسه لنواحيه الطبيعية والبشرية، مطبعة الشفيق- بغداد، ١٩٧٣.
- فەیسەڵ دەباغ، کورد و کەمە نەتەوایەتیەکانی تر لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ دا، بەشی یەکەم، چاپخانەی پەروەردە- هەولێر، ١٩٩٣.
- عەبدوڵڵا غەفور، ئارستۆڤە ت، ف، باری ئەتنۆ- دیمۆگرافی لە باشووری کوردستاندا، گۆڤاری (رگەز و مللەتان) مۆسکۆ، ١٩٨٩، ژمارە -١٩.
* ژمارەی ساڵی ١٩٧٧ لەم تابلەدا کەمێك جیاوازی هەیە لەگەڵ ژمارەی هەمان ساڵ لە شوێنەکانی تر.

٢- جەمال نەبەز، گۆڤاری کۆمۆنیستانەی یەکێتی تێکۆشین، ١٩٤٤-١٩٤٥، بەبێ ناوی چاپخانە، ستۆکهۆڵم-١٩٨٨.

٣- تەماشای ئەم سەرچاوانە بکە :
- لسترنج كى، بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة : بشير فرنسيس و كوركيس عواد، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨٥.
- جاكسون يو، مشاهدات بريطانى فى العراق، ترجمة طة التكريتى، بغداد-١٩٦٩.
- هامر پور گشال، تاريخ امپراطورى عثمانى (جلد ٢) ترجمه ميرزا على ابادى، باهتمام جمشيد كيان فر، پائيز ١٣٦٧، ص٨٧٢.

٤- شمس الدين س.، قاموس الاعلام.

٥- لێرەوە تاکۆتایی گۆڕینی نەخشەی ئیداری ئەستانی کەرکوك لەنامیلکەی (کەرکوك و سیاسەتی تەعریب)ی یەکێتی نیشتیمانی وەرگیراوە، ل٢٣-٢٧، کە لە ساڵی

١٩٨٥ی زاینییدا بڵاوکراوەتەوە،بە دەستیێوەردانێکی زۆر کەم، ئەمەش وابزانم سوودی لە نامیلکەی (سیاسەتی بەعارەبکردنی کەرکوك) وەرگرتووە.

٦- عەبدوڵڵا غەفور، ئارستۆڤە ت،ف، باری ئێتنۆ- دیموگرافی لە باشووری کوردستاندا، گۆڤاری (رگەز و میللەتان ) مۆسکۆ،١٩٨٩،ژمارە -١٩،ل ١٢٤ (بەزمانی رووسی ).

٧- عەبدولقادری کوڕی رۆستەمی بابان، رەوشتی کوردان، مێژووی کوردستان، وەرگێرانی کەریمی حیسامی، ناوەندی چاپ و رازاندنەوەی مەنسوور، ئێسکلستونە - ١٩٩، ل ٢٤.

٨- الجمهورية العراقية، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان ١٩٦٥، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء- بغداد، ١٩٧٣، صفحات عديدة.

٩- رەشاد میران، رەوشی ئاینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، چاپخانەی مەنسور- ستوکهۆڵم، ١٩٩٣، ل٦١.

١٠- هەمان سەرچاوە، ل٦٦.

١١- هەمان سەرچاوە، ل١٥٩.

١٢- عەبدوڵڵا غەفور، ئارستۆڤە ت. ف، باری ئێتنۆ- دیمۆگرافی لە باشووری کوردستاندا، گۆڤاری (رگەز و میللەتان)، مۆسکۆ، ١٩٨٥،ژمارە -١٩٥،ل-١٢٦.

١٣- حوسێنی خەلیقی (دکتۆر)، کۆمەڵناسی کوردەواری، بەرگی دووەم، چاپخانەی (الحوادث)، بەغداد، ١٩٩٢، ل٢٢٠.

# بەشی چوارەم

## شارنشین و گوندنشینەکان

**شار-** بریتییە لە هەموو سەنتەری بەشە ئیدارییەکان، وەك ئەستان، قەزا، ناحیە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ژمارەی دانیشتوان، جۆری چالاکی کۆمەڵانی خەڵکی (پیشەسازی یا کشتوکاڵ)، جۆری ژیان، چەشنی خانووبەرە، سروشتی خزمەتگوزاری و کلتووری و تەندروستی، پەیوەندی کۆمەڵایەتی[1]. بەگوێرەی ئەو پێناسەیە ژمارەی شارنشینان لە ساڵی ١٩٨٧، بریتی بوو لە ٣ ملیۆن و ١١١ هەزار کەس، واتە ٧١٪ لەهەموو دانیشتوان، کە ئەمە کەمێك لە هی وڵاتەکانی دەوروبەری وەکو عێراق (١٩٨٧-٧٠٪) زیاترە.

ژمارەو ڕێژەی شارنشینان لەنێو دانیشتواندا، لەساڵی ١٩٢٧ ەوە تا ئەورۆ بەردەوام لە زیادبووندایە، (تابلی ٧)، هۆی ئەم زۆربونە بۆ چەند فاکتەرێك دەگەڕێتەوە، لەوانە: وێرانکردنی گوندەکانی باشووری کوردستان و گواستنەوەی گوندنشینەکان بۆ سەنتەرە ئیدارییەکان، ئەویش بەمەبەستی قایمکردنی کۆنتڕۆڵی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، لەلایەن دامودەزگاکانی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقیەوە و لە نێوبردنی سەرچاوەکانی ژیان وەك خواردن و خواردنەوە و جێگەی حەوانەوە، بۆ دژایەتیکردن و پاکتاوکردنی هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنی کوردستان و عێراق، کە دژ بە دەوڵەتی بەعسی عێراق دەجەنگان. کۆچکردن لە گوندەکانەوە بۆ شارەکان و گەڕان بەدوای هێمنی و ئاسایش و نان پەیداکردندا، بەرزکردنەوەی پلەی هەندێ ئاوەدانی، ئەویش بەوەرگرتنی سفەتی ئیداری نوێ، پاراستنی ڕێژەی زۆربوونی منداڵبون لەنێو دانیشتوانی شارەکاندا، نزمبونەوەی ڕێژەی مردن لەو ئاوەدانیانەدا بەبەراوردکردن لەگەڵ گوندەکاندا.

**تابلی ٧**

**دینامیکی شارنشین و گوندنشین له باشووری کوردستاندا (١٩٢٧-١٩٨٧)**[٢]

| سەرژمێر | دانیشتوان (هەزار) | شارنیش | | گوندنیش | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | هەزار | % | هەزار | % |
| ١٩٢٧ خەملاندن | ٦١٣ | ٥١ | ٨,٣ | ٥٦٢ | ٩١,٧ |
| ١٩٣٥ خەملاندن | ١٠١١ | ١٢٦ | ١٢,٥ | ٨٨٥ | ٨٧,٥ |
| ١٩٤٧ | ١٣٨٣ | ٢٥٦ | ١٨,٥ | ١١٢٧ | ٨١,٥ |
| ١٩٥٧ | ١٨٢٢ | ٥٧٦ | ٣١,٦ | ١٢٤٦ | ٦٨,٤ |
| ١٩٦٥ | ٢٢١٧ | ٩٦٤ | ٤٣,٥ | ١٢٥٣ | ٥٦,٥ |
| ١٩٧٧ | ٣٣٠٣ | ١٧٩١ | ٥٤,٢ | ١٥١٢ | ٤٥,٨ |
| ١٩٨٧ | ٤٣٨٧ | ٣١١١ | ٧٠,٩ | ١٢٧٦ | ٢٩,١ |

ئەستانەکانی باشووری کوردستان، بەگوێرەی پلەی شارستانێتی، (ئۆربەنیر پرۆڤەنەست) ساڵی ١٩٨٧ یەك لەدواییەك، بەم شێوەیە بوون:

١- **هەولێر**: بەرزترین پلەی شارنشینی لەساڵی ١٩٨٧دا لە هەلێر بوو-٤،٧٧%ی گشت دانیشتوان،(١٩٦٥- ٣٧,٧%، ١٩٧٧- ٥٣,٢%). ئەویش بە هۆی گواستنەوەی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی گوندەکان بۆ ناو شارەکان و دەربەدەرکردنی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی سەر بە ئەستانی کەرکوك، بەتایبەتی شاری کرکوك و دانیشتوانی قەزای خانەقینیش.

٢- **کەرکوك**: رێژەی شارنشینی لەم ئەستانەیەدا، لەساڵی ١٩٧٧دا بریتیبوو لە ٧٥و٤%٪ بە بەراوردکردن لەگەڵ رێژەی سەرجەمی دانیشتواندا (١٩٦٥-

٤٩,٠٪، ١٩٧٧- ٧٠,١٪). ئەم بەشە ئیداریە هەر لەكۆنەوە پلەی شارستانی تێدا بەرزبووە، ئەویش بەهۆی كاروباری پیشەسازی ودەرهێنانی نەوت، بۆیە خەڵكی لەزۆرلاوە روویان تێكردووە، ئەمەش بۆتە هۆی گەشەكردنی كاری خزمەتگوزاری و زیادكردنی شوێنی كار.

٣- **دهۆك**: زۆربەی زۆری دانیشتوانی ئەستانی دهۆك ساڵی ١٩٨٧ لەشارەكان دەژیان و ٧٤,٦٪ ی گشت دانیشتوانیان پێكدەهێنا، (١٩٦٥- ٣٥,٥٪، ١٩٧٧- ٤١,٩٪). هۆیەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەركی شاری دهۆك، لە سەنتەری قەزاوە بۆ سەنتەری ئەستان و پەیدابوونی كارگەی گەورە (١٠ كرێكارو زیاتر) لەئەنجامی گەشەكردنی باری ئابووری و پەیدابوونی شوێنی كاری نوێ و روتێكردنی نەك تەنیا دانیشتوانی ئاوەدانیەكانی دەوروبەر و نێوخۆی خودی ئەستانكە خۆی، بەڵكو دانیشتوانی قەزای شەنگارو هەندێ شوێنی تریش.

٤- **سلێمانی**: رێژەی شارنشینی ساڵی ١٩٨٧ی زۆر لە رێژەی ئەستانەكانی تر كەمتر نەبوو- ٧١,٥٪، (١٩٦٥- ٣٢,٠٪، ١٩٧٧- ٤٧,٢٪)، ئەم رێژە بەرزە دەگەڕێتەوە بۆ خڕبونەوەی ژمارەكی زۆر لەسەربازگە و كارمەندانی عێراقی، هەروەها كردنەوەی زانكۆ لە شاری سلێمانی، كە ساڵی ١٩٨٧ ژمارەی خوێندكارەكانی گەیشتە ٢،٤ هەزار كەس.

٥- **نەینەوا**: نزمترین پلەی شارنشینی لەباشووری كوردستان دا، لەساڵی ١٩٨٧دا لە ئەستانی نەینەوا بوو ٦٧,٦٪ (١٩٦٥- ٤٨,٣٪، ١٩٧٧- ٥٤,٢٪)، هۆیەكەی بەپلەی یەكەم، بۆ مانەوەی خەڵك لە شوێنەكانی خۆیان و كەمی كۆچكردن لە گوندەكانەوە بۆ شارەكان دەگەڕێتەوە.

### تایبەتمەندییەکانی شارنشینی

باری ئابووری ولات کە ربناغەکەی بەزۆری لەسەر کشتوکالْ دامەزراوە، پاراستنی پەیوەندیە کۆمەلایەتیە کۆنەکان (تیرەگەریتی )، باری ئالۆزی رامیاری، نەبوونی پیشەسازی گەورەو قورس و نویْ، خراپی ریگەوبان...هتد. ئەمانە هەموویان پیکەوە، بەشیوەیەکی تایبەتی رەنگیان لەپلەی شارنشینی دانیشتوانی باشووری کوردستاندا داوەتەوە. گرنگترین تایبەتمەندیەکانیش ئەمانەن:

١- خربونەوەی زۆربەی شارنشینەکان لە چەند شاریکی گەورەدا، بۆ نموونە لە سالْی ١٩٨٧دا نزیکەی ٦٠٪ی شارنشینەکان (١ملیۆن و ٩٨٨ هەزار کەس) لە پینج شار دەژیان، (موسلْ، هەولیر، کەرکوك، سلیمانی و دهۆك). هۆیەکانی خربونەوە لەو شارانە دەگەریتەوە بۆ بوونی کارگە و پیشەسازییە جۆراوجۆرەکان، دەزگاکانی ئیداری و فیرکردن، کاروباری بازرگانی، هاتووچۆ، گواستنەوەی گوندەکان، کار و هەندیْ هۆی کۆمەلایەتی...

٢- جیاوازییەکی گەورە لەرووی ژمارەی دانیشتوانەوە، لەنیوان یەکەمین شارو دووەمین شاردا، لەسالْی ١٩٨٧دا هەبووە. ئەم جاوازیە گەشتە ٢١٨ هەزار کەس (١٩٧٧- ١٢٢ هەزار کەس).

٣- شارنشینی درۆ- لەرووی هەلْسوکەوت و پەیوەندی کۆمەلایەتی شارنشینەکانەوە، واتە گوندیەکانی دوینیْ کە کۆچیان بۆ شارەکان کردووە، دوای ئەوەی لە شارەکان دامەزراون و دەژین، بەهیچ شیوەەك نەگۆراون، بەلْکو تەنیْ جیگەی ژیانیان گۆریوە.

٤- بەشیکی زۆر لەدانیشتووە چالاکەکان لەرووی ئابوریەوە، بەشیوەیەکی راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ، لەبواری کشتوکالْدا کاردەکەن.

٥- پایتەختی باشووری کوردستان لە گەورەترین شارەکانی کوردستاندا نییە، بە پێچەوانەی زۆربەی ولاٌتانی جیهانی سێیەم. ژمارەی دانیشتوانی پایتەخت (هەولێر) لە ساڵی ١٩٨٧ دا نزیکەی ٤٤٦ هەزار کەس بوو، ژمارەی گەورەترین شاریش (موسڵ)- ٦٦٤ هەزار کەس بوو.

٦- هەڵاتنی دانیشتوانی شارەکان بۆ دەرەوەی شار و بۆ ماوەیەکی کورت، لەترسی ئازار و ئەشکەنجە. لە مانگی نیسانی ١٩٩١ زۆربەی دانشتوانی شارەکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆك، ڕویان لە ناوچە شاخاوییەکانی نزیك سنووری تورکیا و ئێران و سوریا کرد.

## پۆلینکردنی شارەکان

پۆلینکرنی شارەکان لەباشووری کوردستاندا، بەدوو شێوە ئەنجام دەدەین: ژمارەی دانیشتوان (چەندایەتی) چالاکی دانیشتوان (چۆنایەتی)، کە هەریەکێ لەمانە، لە زانستی جوگرافیادا بایەخی تایبەتی خۆیان هەیە.

## یەکەم: پۆلینکردنی شارەکان بە گوێرەی ژمارەی دانیشتوان

شارەکان- سەنتەری یەکە ئیداریەکان بەگوێڕەی ژمارەی دانیشتوانیان بەسەر نۆ دەستەدا دابەش دەکەین، (تابلی ٨).

**تابلی ٨**

**پۆلێنکردنی شارەکانی باشووری کوردستان بە گوێرەی ژمارەی دانیشتوان**[٣]

| دەستەی شار | ١٩٧٧ | | | ١٩٨٧ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارە ی شار | دانیشتوان هەزار | % | ژمارەی شار | دانیشتوان هەزار | % |
| ٥٠٠ و زیاتر | - | - | - | ١ | ٦٦٤ | ٢١,٣ |
| ٥٠٠-١٠٠ | ٤ | ١١٠٧ | ٦١,٨ | ٤ | ١٣٢٤ | ٤٢,٦ |
| ١٠٠-٥٠ | ١ | ٥٧ | ٣,٢ | ٤ | ٢٦٥ | ٨,٥ |
| ٥٠-٣٠ | ٢ | ٧٠ | ٣,٩ | ٧ | ٢٨١ | ٩,٠ |
| ٣٠-٢٠ | ٤ | ٩٤ | ٥,٣ | ٤ | ١٠٤ | ٣,٤ |
| ٢٠-١٠ | ٦ | ٨٨ | ٤,٩ | ١٦ | ٢٤٦ | ٧,٩ |
| ١٠-٥ | ٢٩ | ٢١٩ | ١٢,٢ | ١٩ | ١٣٦ | ٤,٤ |
| ٥-٢ | ٣٤ | ١٠٩ | ٦,١ | ٢٣ | ٨٣ | ٢,٧ |
| لە٢ کەمتر | ٤٩ | ٤٧ | ٢,٦ | ١٥ | ٨ | ٠,٢ |
| تێکرا | ١٢٩ | ١٧٩١ | ١٠٠,٠ | ٩٣ | ٣١١١ | ١٠٠,٠ |

بۆ ئەوەی بەتەواوی لە نەخشەی دابەشبوونی شارنشینەکان بگەین، ئەو شارانەی کە بە ژمارە لە یەکتریەوە نزیکن، کۆیان دەکەینەوە و لەژێر دەستێکی گەورەتردا پۆلینیان دەکەین.

١- **شار**: ئەم زاراوەیە بۆ ئەو ئاوەدانیانە بەکار دەهێنین، کە ژمارەی دانیشتوانیان لە ٢٠ هەزار کەس زیاترە. لە راستیدا هەر لەم ئاوەدانیانەدا وەك تێگەیشتنێکی تەواو بۆ شار دێتە بەر چاو. ئەمەش دەکرێ بەچەند بەردەستە:

**أ- شاری زۆر گەورە** (١٠٠ هەزار کەس و زیاتر)- لە باشووری کوردستاندا تەنیا پێنج ئاوەدانی لەم چەشنە هەیە (١٩٧٧- ٤ شار) واتە ٥,٤٪ ی گشت شارەکان، (١٩٧٧- ٣,١٪)، لەگەڵ ئەمەشدا نزیکەی ٦٤٪ ی شارنشینی تێدا دەژین (١٩٧٧- ٦٢٪). هۆیەکانی بریتیە لە خربونەوەی زۆربەی پیشەسازیە تازەکان و دوو لەسەر سێی دامودەزگا سەرەکیەکانی دەوڵەت و کاروباری ئیداری و زانکۆ و ئامۆژگا و خوێندنگەکان و بەشی تەندروستی و نەخۆشخانەکان و کڕن و فرۆشتن.........

لەناو ئەمانەدا موسڵ (١٩٦٥- ٢٦٤ هەزار کەس، ١٩٧٧- ٤٣٠ هەزار کەس، ١٩٨٧- ٦٦٤ هەزار کەس) گەورەترین شارە نەك هەر تەنیا لەدەستە نێو خۆییەکاندا، بەڵکوو لەناو گشت شارەکانی باشووری کوردستاندا.

**ب- شاری گەورە** (١٠٠-٢٠ هەزار کەس)- بەژمارە زۆرترە لە یەکەم (١٩٧٧- ٧ شار، ١٩٨٧- ١٥ شار)، بە دانیشتوان زۆر گچکەترە لەیەکەم (١٩٧٧- ١٢,٤٪، ١٩٨٧- ٢٠,٩٪)، ئەم شارانە بەزۆری سەنتەری قەزاکانن، وەك ئەزانین پلەی پێشکەوتنی پیشەسازی و بازرگانی و خوێندن گەلێك لە چاو پلەی یەکەمدا نزمترە. لەهەمان کاتیشدا ژێرخانی ئابوریەکانیان لەو ئاستەدا نییە کە بتوانن کار بۆ گشت دانیشتوانی ئەو شوێنانە پەیدا بکەن، هەروەها

چالاکی زۆربەی زۆری ئەو شارە گەورانە لەسەر کشتوکاڵ دامەزراوە، بەتایبەتی (کشتوکاڵی بەرفراوان) کە پێویستی کەمی بە کرێکاران هەیە.

## ٢- شارۆچکە

باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و رامیاری لە ئاوەدانیەکانی کە ژمارەی دانیشتوانیان لە نێوان ٢٠-٥ هەزار کەسە، لەچاو ئاوەدانیەکانی تردا گەلێك دواکەوتووە (٢٠ هەزار کەس و زیاتر)، لەبەر ئەوە بەڕاست دەرناچێ، ئەگەر بەهەمان زاراوەی (شار) ناویان بەرین. بۆیە ئێمە زاراوەی (شارۆچکە) بە شایانی ئەم ناوە دەزانین. وەك ئەوانەی پێشووتر، بەسەر دوو دەستەدا دابەشیان دەکەین:

### أ- شارۆچکەی گەورە (٢٠-١٠ هەزار کەس)

ژمارەی شار و دانیشتوانی ئەم بەردەستەیە، هەمیشە لەزیادبوندایە. لەم شارۆچکانە جگە لە بەڕێوەبردن گەلێ خزمەتگوزاری تر هەیە وەکو خوێندنگەی ناوەندی و سەرەتایی کچان و کوران و نەخۆشخانە و دوکانی فرۆشتنی شتومەکی هەمەچەشنە چاکردنەوەی ئۆتۆمبێل و ماکینەی تر، لەگەڵ ئەم کارە شارستانیەشدا هێشتا کشتوکاڵ بە بناغەی چالاکی دانیشتوان دادەنرێ، ئەمانە هەموویان بونەتە هۆی زیادبوون ژمارەی دانیشتوان.

### ب- شارۆچکەی بچکۆلە (١٠- ٥ هەزار کەس)

ئەگەرچی ژمارەی شارۆچکەکان و دانیشتوانیان لەکەمبون دایە، لەگەڵ ئەمەدا یەك لەبەردەستە گەورەکان دادەنرێ بەو دیاردەیە. لەم شارۆچکانە مرۆڤ بۆی هەیە، پێویستیە سەرەکیەکانی ژیان لە خواردن و جل و بەرگ و هەندێ خزمەتگوزاری لە قوتابخانەو نەخۆشخانەو کارەبا و هەروەها شتومەکی دەستی دابین بکات.

### ٣- شارۆکە

ئاوەدانیەکانی ئەم جۆرە کە ژمارەی دانیشتوانیان لە ٥ هەزار کەس کەمترە، بەشارۆکە ناویان دەبەین، چونکە باری ئابووری و کۆمەڵاتیان، زۆر لەگەڵ گوندەکانی دراوسێیاندا نزیکن. لەگەڵ ئەوەشدا جۆرە جیاوازیەك لەنێوانیاندا دێتە پێش چاو. لەبەر ئەو هۆیە، وەك ئەو بەشانەی پێششوتر دابەشیان دەکەین بەسەر دوو بەردەستەدا:

أ- **شارۆکەی گەورە:** بەگوێرەی ژمارەی دانیشتوان و ئاوەدانی بەیەك لە گەورەترین بەردەستە دادەنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە ژمارەکەشی کەم بۆتەوە لە ٣٤ بۆ ٢٣ لە نێوان ١٩٧٧- ١٩٨٧ دا، واتە ١١ دانە. ژمارەی دانیشتوانەکەی لە چاو ژمارەکە زۆر کەمە و لە ساڵی ١٩٨٧ دا لەدەوروبەری ٣٪ (١٩٧٧- ٦,١٪) بوو. هۆکەشی، وەك لە شوێنی تردا باسکراوە، بۆ هەڵوەشاندنەوەی چەند ناحیەیەك دەگرێتەوە.

ب- **شارە دێ:** بەکارهێنانی زاراوەی شارەدێ بۆ ئاوەدانیەکانی تیپی شار، کە ژمارەیان لە دوو هەزار کەمترە، بەتەواوی لەگەڵ چەشنی چالاکی ئابووری، کشتوکاڵی، پەیوەندی کۆمەڵایەتی و خێڵەکی دەگونجێ.

شارەدێ لەرووی ژمارەوە گەورەترین بەردەستەیە، بەڵام ژمارەی دانیشتوانی لە گشت بەردەستەکانی تر کەمترە. ئەوەی سەرنجراکێشە، کەمبوونەوەی ئەو ژمارانەیە لە ٤٩ بۆ ١٥ لە نێوان ١٩٧٧ و ١٩٨٧، واتە ٣٤ شارەدێ. لەهەمان کاتیشدا، ژمارەی دانیشتوانی لە ٤٧ هەزار کەسەوە بۆ ٨ هەزار کەس هاتۆتە خوارێ، واتە ٣٩ هەزار کەسی کەم کردووە. ئەوەش لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی ئیداری چەند ناحیەیەکی وەکو بارزان، تیلەکۆ، رزگاری، شوان و چۆڵکردنی دانیشتوانی سەنتەری ناحیەکانی تری وەك دیبەگە، گەرمك، مزوری باڵا.

چالاکی ئابووری شارەدێکان بەهیچ جۆرێ جیاوازی لەگەڵ گوندەکانی دەوروپشتدا نییە، خۆ ئەگەر سیفەتی ئیداری لەبەر چاو نەگرین، ئەوا هیچ دیاردەیەك نامێنێ کە لە دراوسێکان جیایان بکاتەوە.

**دووەم: پۆلینکردنی شارەکان بەگوێرەی ئەرک**

شارەکانی باشووری کوردستان بەگوێرەی ئەرکەکانیان، یا بەگوێرەی جۆری خزمەتگوزاری و بەرهەمی پیشەسازی، یا بەگوێرەی چەشنی چالاکی ئابووری، لەبەر جیاوازی پەرەسەندنی مێژوویی و هەڵکەوتی جوگرافی و بارودۆخی ئابووری و رەوشی زانیاری و کۆمەڵایەتی لەیەکتر ناچن. بەلەبەر چاوگرتنی هەموو ئەم هۆیانە و ژمارەی دانیشتوان، دەتوانین شارەکان بە گوێرەی پۆلینکردنیان لەسەر بناغەی ئەرکەکانیان بەسەر چەند دەستەدا دابەش بکەین:

**١- پایتەخت**

پایتەختی باشووری کوردستان لە حوزەیرانی ١٩٩٢ پاش راگەیاندنی دەسەڵاتی فیدراڵی، شاری هەولێرە پەرلەمانی کوردستان و ئەنجومەنی وەزیران و دەزگاکانی حوکومەت مەڵبەندی دامودەزگە جیهانییەکان، بارەگای هێزە رامیارییەکان، زانکۆ و پەیمانگە، نەخۆشخانەی گەورە، کاروباری بازرگانی و بانکەکان، سەنتەری هاتووچۆی نێوان شارەکانی تری کوردستان، هەمووی لەم شارەدا کۆبونەتەوە، کە ئەمانە پێکەوە بونەتە هۆی زیادکردنی دانیشتوانی شارەکە. (١٩٦٥- ٩١ هەزار کەس، ١٩٧٧- ١٩٤، ١٩٨٧- ٤٤٦، ١٩٩٤- ٩٥٠ هەزار کەس (خەملاندنی نووسەر). فراوانبونی پانتایی (١٩٩٤- ٧٥٠ هەزار هێکتار (خەملاندنی نووسەر). چربوونی دانیشتوان (١٩٩٤- ٣٥٠ کەس لەیەك کچگ)، دروستکردنی گەرەکی نوێ و گورینی شێوەی دروستکردنی خانووبەرەکان لەو شێوە ئاساییەی جارانەوە بۆ خانووی بەرز و چەند قات ...هتد.

### ٢- شاری ئەرکی هەمەچەشنە

شارەکانی ئەم دەستەیە، لە شوێنە سەرەکیەکانی خڕبونەوەی پیشەسازی کۆن و نوێ، بازرگانی، بەیەکەگەیشتنی ڕێگاوبان، خوێندنی بەرز- زانکۆ، پەیوەندی لەگەڵ دەرەوە بوونی گەلێ دامودەزگای گرنگ و سەرەکی حکومەت...تاد دیاری دەکرێ. موسڵ تاکە شارە کە ئەم هەموو سیفەتانەی تێدا خڕبوبێتەوە، لەبەر ئەوە ژمارەی دانیشتوانیشی لە ژمارەی دانیشتوانی گشت شارەکانی باشووری کوردستان زیاترە. لە ساڵی ١٩٨٧ دا لە دەوروبەری ٦٦٤ هەزار کەسدا بوو (١٩٩٤- نزیکەی یەك ملیۆن کەس بوو. (خەملاندنی نووسەر).

### ٣- شاری خزمەتگوزاری

پلەی خزمەتگوزاری و قەلەمڕەوی چەشنەکانی لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر دەگۆڕێ. لەبەر ئەوە شارەکان بەگوێرەی خزمەتکردن بەسەر سێ بەردەستەدا دابەش دەکەین:

#### أ- شاری خزمەتکردن لەسەر ئاستی ئەستانەکان

سەنتەری ئەستانکان لەم بەشەدا بەگەورەترین شوێن دادەنرێت، لە چوارچێوەی ئەم بەشە ئیدارییانەدا، بۆ خزمەتکردن لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە، نەك هەر تەنیا بۆ سەنتەری شارەکە، بەڵکو بۆ گشت بەشە ئیداریەکانی تریش کە بەشێوەی ئیداری پێکەوە بەستراون. مرۆڤ دەتوانێ گشت پێداویستیەکانی ژیان لەخواردن و جل و بەرگ و ئامرازی و شتومەکی پیشەسازی و دەرمان و پێداویستیەکان تەندروستی و لەشساغی و خوێندن، گواستنەوە و هاتووچۆ، دەرهێنانی هەموو چەشنە دەکۆمێنتێکی پێویست بە مەبەستی بەکارهێنانی لەدەرەوە و ناوەوەی وڵات، لەسەنتەری ئەم ئەستانانەدا دەست بکەوێ، لەهەمان کاتیشدا، دەتوانێ بەرهەمی کشتوکاڵی و دەستکردە خۆماڵیەکانی خۆی بۆ فرۆشتن بخاتە بازارەوە. دهۆك بە گونجاوترین نموونەی ئەم بەردەستە شارە دادەنرێ.

### ب- شاری خزمەتگوزاری لەسەر ئاستی قەزا

ئەم شارانە بەسەنتەری ئیداری و خوێندن و لەشساغی و بازرگانی و رێگەوبانی ناحیـەکان و گـشت ئاوەدانییـەکانی تـر دادەنرێ. دانیـشتوانی ناحییـەکان بـۆ هەڵسورانی کاروباری رۆژانەیان و سودوەرگرتن لە خزمەتگوزاریەکان، هەموو رۆژ دەچنە سەنتەری قەزایەکان. لەباشووری کوردستاندا زیاتر لە ۳۰ شارۆچکە هەن، کە کارەکەیان برتییە لە پێشکەشکردنی خزمـەت بـۆ دانیـشتوانی ناحییـەکان. لەوانە: کۆیە، رواندز، زاخۆ، ئامێـدی، هەڵەبجـە، پێنجـوێن، پـشدەر، چـوارتا، تەلەعفەر، حەمدانییە...هتد.

### ج- شاری خزمەتگوزاری لەسەر ئاستی ناحیە

کاروباری ئیداری و خوێندنی سـەرتایی و ناوەنـدی و نەخۆشـخانە و پۆسـتە و بازار، لەسەنتەری ئەم ناحیانە مۆڵیانداوە. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی کە رۆژ بەرۆژ، ژمارەیەك لە دانیشتوانی گونـدەکانی ناحیەکـە، بەمەبەسـتی سـودوەرگرتن لـە خزمەتگوزارییەکان و بۆ بەرێوەچوونی کاروباری تایبەتی رۆژانەی خۆیـان، زیـاتر روو لە سەنتەری ناحیەکان بکەن. شارۆکەی خزمەتکردن لە باشووری کوردستاندا زۆرن: دیبەگە، شیروان مازن، دیانە، قەرەداغ، قادر کەرەم، زەرباتییە... تاد.

### ٤- شاری پیشەسازی

بەشێوەیەکی گشتی، باشووری کوردستان بە کانزای هەمە چەشنە گەلێك دەوڵەمەندە و هەندێکیشیان لە جیهاندا ناویان دەرکردووە. نەوت- ئەم کانزایە لە کۆنەوە لە قەزاکانی کفری و خانەقین دەردەهێنرێ و پاك دەکرێتەوە، بەڵام دەرهێنانی نەوت بە شێوەیەکی ئابووری لە ساڵی ۱۹۲۷ دەستی پێکرد و لە ناوچەی بابەگوڕگوڕ لە دوای شوێنەکانی تر دۆزرایەوە. شارەکانی کەرکوك،

خانەقین، عەینزاله و هەندێ شوێنی تر، ئەورۆ سەنتەری پیشەسازی و نەوت دەرهێنانن.

### ٥- شاری سنووری

پەیوەندی باشووری کوردستان لە گەڵ وڵاتەکانی دەوروبەر و جیهاندا، بەشێوەیەکی فەرمی لە رێگەی چەند دەروازەیەکەوە بە ئەنجام دەدرێ، کە بەشێك لە دانیشتوانی ئەو ناوچانە، بەبازرگانی و کاروباری ئابووری و چالاکی رێکخستنی هۆیەکانی هاتووچۆوە خەریکن. شارۆکەی برایم خەلیل، حاجی ئۆمەران، بەباشترین نموونەی ئەم چەشنە شارانە دادەنرێن.

### ٦- شاری هاوینە هەواری

گەلێ شوێن لە کوردستان، لەبەر سازگاری ئاووهەوای، جوانی سروشت، بە تایبەتی لە ناوچە شاخاوییەکاندا، بۆیان هەیە ببنە شوێنی هاوینە هەوار. لەم ساڵانەی دواییدا، هەندێ شوێن لەو ناوچانە، بونەتە ناوچەیەکی گەشتوگوزاری و سەنتەرێك کە سەرنجی هەزاران خەڵکی بەلای خۆیدا راکێشاوە. دانیشتوان لە باشووری کوردستان و وڵاتانی دەرەوە، بزوتنەوەی توریزم، لە ساڵانی پر لە هێمنی و ئاسایشدا- داراییەکی زۆر گەورە بە خەزێنەی دەوڵەت دەبەخشن، کە بەشێوەیەکی ناڕاستەخۆ کار لە گەشەکردنی ژیانی ئابووری ناوچە جیاجیاکان دەکا. لە شارۆکە هاوینە هەوارییە بەناوبانگەکانی ئەورۆی باشووری کوردستان: سۆلاڤ، سەلاحەدین، سەرچنار، شەقڵاوە.

## گوند

جگە لە دانیشتوانی سەنتەری ئەستان و قەزا و ناحیەکان، هەموو دانیشتوانی ئەو ئاوەدانیانەی تری کوردستان دەگرێتەوە. دانیشتوانی ئەم گوندانە، لەساڵی ١٩٨٧دا ڕێژەیان لە دەوروبەری ٢٩٪ دا بوو (١ملیۆن و ٢٧٦ هەزار کەس)، کە ئەم ڕێژەیە لە هەمان ساڵدا لە عێراق ٣٠٪ بوو.

ژمارەی دانیشتوانی گوندنیشەکان، وەك ژمارەی دانیشتوانی شارنیشینەکان بەردەوام لە زیادبووندان. بەڵام ڕێژەیان لەگشت دانیشتوان، لەنیو سەدەی دواییدا (١٩٢٧- ١٩٨٧) لە ٩٢٪ەوە بووبە ٢٩٪، واتە ٦٣٪ کەمیان کردووە. (تابلی ٧) ئەویش لە ئەنجامی کاولکردنی کوردستان و گواستنەوەی گوندنشینەکان بۆ ئۆردوگای زۆرەملێ و خڕکردنەوەی دانیشتوانی ٣٨٣٩ گوند، لەو ئۆردوگایانەدا و کۆچکرنی هەندێکی تریان بۆ سەنتەری شار و شارۆچکەکان، کردنی هەندێ لە گوندەکان بە سەنتەری ناحیە، کارێکی گەلێك خراپی کردە سەر ڕێژە و ژمارەی دانیشتوانی گوندەکان.

ڕێژەی گوندنشینەکان لە ئەستانەکان، لەساڵی ١٩٨٧ دا لێك نزیك بوون. لەبەر پیادەکردنی سیاسەتی لەناوبردن و کۆکردنەوەی خەڵك لە شارەکان و کەمبوونەوەی جیاوازی لەچەشنی چالاکی ئابووری، کە ئێستا زۆربەی چالاکی شارستانییە، هەروەها کەمبوونەوەی ڕۆڵی فاکتەری سروشتی (گەرما، باران) و کۆمەڵایەتی (پێکەوە ژیان لە ئاوەدانییەکاندا، بەبێ گوێدانە پەیوەندی خێڵەکی).

بەرزترین ڕێژەی گوندنشینەکان لە ئەستانی سلێمانیدا بوو- ٤،٢٨٪ی گشت دانیشتوان (١٩٧٧- ٨،٥٢٪)، لەدوایدا نەینەوا دێ ٢،٢٨٪ (١٩٧٧- ٨،٤٥٪)، پاشان دهۆك- ٤،٢٥٪ (١٩٧٧- ١،٥٧٪) ئینجا کەرکوك- ٦،٢٤٪ (١٩٧٧- ٩،٢٩٪)، لەدوای هەموویان هەولێر- ٢٢,٦٪ (١٩٧٧- ٨،٤٦٪).

گوندەکانی باشووری کوردستان لەرووی ئەرکەوە، بەسەر سێ دەستەدا دابەش دەکەین:

**١- گوندی کشتوکاڵی:** دانیشتوانی ئەم جۆرە گوندانە، بەکشتوکاڵکردنەوە خەریکن، زۆربەی زەوی ئەم گوندانە بۆ چاندن و بەرهەمهێنانی بەروبومی کێلگەیی وەکو دانەوێڵە (گەنم و جۆ) و پیشەسازی (توتن، لۆکە، چەوەندەر) و ئالیکی (سێپەر و وێنجە) بەکار دەهێنرێ و خۆیان بە بەخێوکردنی مەڕ و ماڵاتەوە خەریك دەکەن.

**٢- گوندی ناکشتوکاڵی:** دانیشتوانی ئەم جۆرە گوندانە بەپلەی یەکەم بە ئەرك و ئیشوکاری کڕین و فرۆشتن، هێنان وبردن، چەك هەڵگرتن، پاسەوانیەوە خەریکن وژمارەیان زۆر نییە.

**٣- گوندی تێکەڵاو:** بەرهەمهێنانی بەروبومی کشتوکاڵی جۆراوجۆر کڕین و فرۆشتن، هێنان و بردن، چەك هەڵگرتن، پاسەوانی، لەئەرکە سەرەکیەکانی دانیشتوانی ئەم گوندانەن. هەروەها زۆربەی سەنتەری ناحیەکان، بۆیان هەیە لەگەڵ ئەم گروپەدا دابنرێن.

لەبەر ئەوەی سەرچاوە فەرمیەکان، زانیاری جۆراوجۆر دەدەن، ژمارەی تەواوی گوندەکان لەبەر دەستدا نییە، بەگوێرەی ئەنجامی کۆتای سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧، ژمارەی گوندەکان (شوێنی ژیان) لە باشووری کوردستاندا ٤٩٠٠ گوند بوو (١٩٥٧- ٥٨٠٠) واتە ٣٨٠ گوند بەرامبەر یەك شار (١٩٥٧-٤٥ گوند).

ژمارەی گوند لە ١٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەدا لە باشووری کوردستان ساڵی ١٩٧٧، لە دەوروبەری ٥،٦ گوند بوو، (١٩٥٧- ٧،٧ گوند). ئەم ژمارەیەلە شوێنە بەپیزەکان و ئاوەدارەکان، وەك دەشتی شارەزوور، نزیکەی دوو جار لە دەشتاییەکانی کە سەرچاوەی ئاویان لەسەر باران راوەستاوە، کەمێك کەمترە، لە ناوچە شاخاوییەکاندا نیو ئەوەندیە، ئەویش لەبەر کەمی زەوی بۆ کشتوکاڵ.

ناوەندی ژمارەی دانیشتوان لەیەك گوند لە ساڵی ١٩٧٧ دا. نزیکەی ٢٠٠ کەس بوو (١٩٥٧- ٧١ کەس). جیاوازی نێوان گەورەترین و گچکەترین گوند

چەند سەد کەسێکە. گوندەکان لەرووی ژمارەی دانیشتوانەوە، بەسەر چوار دەستەدا دابەش دەکەین:

١- **گوندی گەورە** (١٠٠٠ کەس و زیاتر)، بە ژمارە زۆر نییە، بەڵام ڕێژەی دانیشتوانیان لەگشت دانیشتوانی گوندەکانی دیکە (١٣٪) زیاترە، ئەم گوندانە بەزۆری لەسەر زەوی بە پیت و ئاوی زۆر هەڵکەوتوون.

٢- **گوندی ناوەندی** (٥٠٠- ١٠٠٠) کەس. ژمارەیان سێ جار لەژمارەی بەشی یەکەم زیاترە، ژمارەی دانیشتوانیشی نزیکەی ٣٤٪ ی گشت دانیشتوانی گوندەکانی تر دەبێت، ئەم گوندانە لە زۆر ناوچەکانی باشووی کوردستاندا هەن.

٣- **گوندی گچکە** (٥٠-٥٠٠) کەس، زۆربەی گوندەکانی باشووری کوردستان سەر بەم دەستەیەن، بەڵام ژمارەی دانیشتوانیان لە ٢٣٪ زیاتر نابێ و زۆربەی ئەم گوندانە لە زەوییەکی بێ پیت و بێ ئاودا هەڵکەوتوون.

٤- **کوێرە گوند** (٥٠- کەس و کەمتر) ئەم جۆرە گوندانە، بەزۆری دەکەونە نێوچە شاخاویەکانەوە، بەتایبەتی شوێنە بێ ئاوەکان و ئەو زەوییانەی بە کەڵکی کشتوکاڵ نایەن و چەپەرن.

لەئەنجامی چەند فاکتەرێکی وەکو، هۆی سروشتی و مێژوویی، ترادیسیۆنی نەتەوەیی، فاکتەری ئابووری و کۆمەڵایەتی، باری نەتەوەیی و ڕەوشی ڕامیاری و جەنگ، شێوەی گوندەکان، لە باشووری کوردستاندا هەمە چەشنەن. گرنگترین شێوەی ئەو گوندانە ئەمانەن:

**١- گوندی هەرمێیی**

ئەم جۆرە لە نێوچە شاخاوییەکاندا زۆر بڵاوە. ڕیزی یەکەم لەناو دۆڵەکە دروست دەکرێ، لەسەروییەوە ڕیزێکی تر و لەدوای ئەویەوە ڕیزێکی تر دێ. بەم شێوەیە گوندەکان بەقەد پاڵی شاخەکانەوە بەرز دەبنەوە، کەلە هەندێ نێوچەدا بەرزاییان

تا ٥٠٠ مەتر دەروا و ریزەکان بەرەبەرە تەسك دەبنەوە، تا وای لێ دێ ژمارەی خانووەکانی دوا ریز، لەدوو یا سێ خانوو تێپەڕ ناکا. لەزۆر شوێنیش سەربانی ریزی پێشەوەی ماڵەکان دەبنە حەوشە و ڕێگەی هاتووچۆ بۆ ریزی سەرەوەی خۆی. خەڵك خانووەکانیان بەم شێوەیە دروست دەکەن، بۆ ئەوەی دەست بە زەویەکانیانەوە بگرن و بۆ چاندن و کشتوکاڵ بە کاری بهێنن و تا بە کەمترین ماندوبوون بگەنە سەر سەرچاوەکانی ئاو و خۆ لە سەرمای زستان بپارێزن، چونکە دۆڵەکان کەمتر با دەیانگرێتەوە.

### ٢- گوندی هۆبەیی

ئەوە هەمووو ئەو گوندانەن کە لە کۆمەڵە ماڵی کەمێك لەیەك دوورەوە پێکهاتوون. دانیشتوانی ئەو گوندانە بە ژمارەی خێزان گەورەن (یەك بەرەباب). ماڵی گەورەکەیان زیاتر لە ناوەراستدا هەڵدەکەوێ.

### ٣- گوندی رشتی

لەو جۆرە گوندانە، بە شێوەی گەرەك گەرەك پێك هاتووە، پەیوەندی خزمایەتیان کەمە. ئامانجیان لەم شێوە دروستکردنەدا، هاوبەشیکردنە لە پاراستن و سوود وەرگرتن لە سەرچاوەی ئاو، وەکو کانی، بیری دەستی و بیری ئیرتیوازی.

### ٤- گوندی پەرشوبلاو

ئەمە هەموو ئەو جۆرە گوندانە دەگرێتەوە، کە هیچ پەیوەندیەکی خزمایەتی دانیشتوانی گوندەکان پێکەوە نابەستێ. دانیششتوانی ئەم جۆرە گوندانە، بەشێوەیەکی گشتی شوێنێکی دیاریکراویان لەنێو گوندەکاندا بۆ بەیەکگەیشتن نییە، جگە لە مزگەوت.

### ٥- گوندی لاکێشەیی

تازەترین شێوەی گوندە. خانووەکان لەمبەرو ئەوبەری شەقامەکان دروست دەکرێن. ئەم چەشنە تەنیا لە نێوچە دەشتاییەکان نابینرێ، بەڵکو لە نێوچە شاخاوییەکانیشدا هەیە، بەڵام لەو نێوچانەدا، لەرۆخی چەم و رووبارەکاندا دروست دەکرێن.

### ٦- گوندی شەترەنجی

پەیدابوونی ئەم شێوە نوێیە بۆ ساڵەکانی حەفتا دەگەڕێتەوە. ئەم جۆرە گوندانە، لەسەرەتاوە بۆ دانیشتوانی گوندە راگوێزراوەکانی سەر سنوورەکان دروستکران، خانووەکانی بە شێوەیەکی ئەندازیاری، بەرامبەر بەیەکتری دروستکراون و شەقامەکانیشیان بەناودا تێپەر دەبێ، ئامانجی سەرەکی لەو دامەزراندنە، کۆنترۆڵکردنی هەڵسوکەوتی خەڵکی و رێگەگرتن لە چالاکیەکانی پێشمەرگە لەناو جەماوەر، هەر بۆیەش لە ناو کۆمەڵانی خەڵکدا، بە (ئۆردوگای زۆرەملێ) ناوی دەرکردووە.

## سەرچاوە و پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

١-عەبدللا غەفور، تایبەتمەندیەکانی جێنشینی شاروگوند لەعێراق، نامەی دکتۆرا، مۆسکۆ،١٩٨٠ (بەزمانی رووسی).

٢- نووسەر لەم سەرچاوانەی تاوتوێ کردووە:

- المملكة العراقية، مديريةالنفوس العامة، نتائج التعدادالعام للسكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الاول والثاني، بغداد، ١٩٥٤، صفحات عديدة.

-الجمهورة العراقية، وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل العام ١٩٥٧: لوائى ديالى وكوت، مطبعة العاني- بغداد، ١٩٦١.لوائى السليمانية و كركوك، مطبعة العاني- بغداد، ١٩٦١.لوائى الموصل و اربيل، مطبعة الارشاد— بغداد، ١٩٦١.

- الجمهورية العراقية، وزراة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٦٥، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء- بغداد، ١٩٧٣.

- الجمهورية العراقية، وزراة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧، لمحافظة اربيل، دهوك، السليمانية، ديالى، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء- بغداد، ١٩٧٨.

- الجمهورية العراقية، وزراة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧، لمحافظة اربيل، دهوك، السليمانية، ديالى، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء- بغداد، ١٩٨٨.

٣- نووسەر لەم سەرچاوانەی تاوتوێ کردووە:

- المملكة العراقية، مديرية النفوس العامة، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الاول والثاني، بغداد، ١٩٥٤، صفحات عديدة.

- الجمهورية العراقية، وزاة الداخلية، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتجيل عام ١٩٥٧: لوائى ديالى و الكوت، مطبعة العاني- بغداد، ١٩٦١. لوائى

السليمانية و كركوك، مطبعة العاني- بغداد، ١٩٦١. لوائى الموصل و اربيل، مطبعة الارشاد- بغداد، ١٩٦١.

- الجمهورية العراقية، وزراة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٦٥، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء- بغداد،١٩٧٣.

- الجمهورية العراقية، وزراة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧، لمحافظة اربيل، دهوك، السليمانية، ديالى، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء- بغداد، ١٩٧٨.

- الجمهورية العراقية، وزراة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، مديرية الاحصاء السكانى، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧، لمحافظة اربيل، دهوك، السليمانية، ديالى، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء- بغداد، ١٩٨٨.

# سەرباری ئاماری

## سەرباری ١

### دانیشتوانی باشووری کوردستان بەگوێرەی زمانی دایك -١٩٥٧ *

| ئەستان | دانیشتوان | زمان | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | کورد | عارەب | تورکمان | سریانی | نەزاندراو |
| هەولێر | ٢٧٣٣٨٣ | ٢٤٣٣٣٥ | ١٧٩١٥ | ٦٨٧٣ | ٤٦٨٩ | ٥٧١ |
| خانەقین | ١٩٠٢٢٨ | ١٢٩٣٥٦ | ٤٥٦٥٥ | ١٣٣١٦ | - | ١٩٠١ |
| سلێمانی | ٣٠٤٨٩٥ | ٢٩٩٩٣٦ | ٣٢٨٥ | ٣٦٦ | ٣٣٨ | ٩٧٠ |
| کەرکوك | ٣٨٨٨٣٩ | ١٨٧٥٩٣ | ١٠٩٦٢٠ | ٨٣٣٧١ | ١٦٠٥ | ٦٦٥٠ |
| موسڵ | ٦٤٨٣٠٩ | ١٤١٢٠٦ | ٤٥١٨٥٠ | ٦٨٧٣ | ٤٦١٧٥ | ٢٢٠٥ |
| هی دیکە | ١٦٧٣٦ | ٧٤٦ | ١٤٧٣٤ | ٣٤٧ | ٣٥ | ٨٧٤ |
| تێکرا | ١٨٢٢٣٩٠ | ١٠٠٢١٧٢ | ٦٤٣٠٥٩ | ١١١١٤٦ | ٥٢٨٤٢ | ١٣١٧١ |

---

* نووسەر لەم سەرچاوانەی تاوتوێ کردووە:

- الجمهورة العراقية، وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائى ديالى وكوت، لوائى السليمانية وكركوك، لوائى الموصل واربيل، مطبعة العانى- بغداد، ١٩٦١.

- عەبدوللا غەفور، ئارستۆڤە ت. ف، باری ئەتنۆ- دیمۆگرافی باشووری کوردستان، گۆڤاری (رەگەز و میللەتان)، مۆسکۆ، ١٩٨٩، ژمارە- ١٩.

## سەرباری ٢

### دانیشتوانی كوردستان بە گوێرەی زمانی دایك- ١٩٦٥ *

| ئەستان<br>قەزا ناحیە | ژمارەی دانیشتوان | زمان | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | كوردی | عارەبی | توركمانی | هیتر |
| **دهۆك** | **١٤٥٨٤٣** | **١١٤٩٣٥** | **١٥٢٥٠** | **١٧٢٩** | **١٣٩٢٠** |
| سەنتەر | ١٧٦٤٦ | ١٣٧٧٤ | ١٠١٣ | ١٧ | ٢٨٤٢ |
| سیمێل | ١٢٨٤٥ | ٧٠٦١ | ٣٣٠١ | ١٤٠٧ | ١٠٧٦ |
| دۆسكی | ٢٧٣١ | ١٦٥٦ | ١٠٧ | - | ٩٦٨ |
| زاوێتە | ٣٥٨٠ | ٢٧١٢ | ٧٢٩ | ٦ | ١٣٣ |
| مزوری | ٣٥٦ | ٢٥٢ | ١٠٢ | - | ٢ |
| ئامێدی | | | | | |
| سەنتەر | ٣٣١٠ | ٢٠٠٢ | ٨٤٨ | ١١ | ٤٤٩ |
| سەرسەنگ | ٤٢٦٤ | ١٧٤٤ | ١٨٥٩ | ٣٢ | ٦٢٩ |
| نێروە و رێكان | ١١٧٧٣ | ١١٣٦٥ | ٤٠ | ١ | ٣٦٧ |
| بەرواری باڵا | ١٦٣٨٤ | ١٥٥٢٥ | ١٧٣ | - | ٦٨٦ |
| زاخۆ | | | | | |
| سەنتەر | ١٤٦٤٧ | ١١١٧٣ | ١٨٩٨ | ٢٣٥ | ١٣٤٢ |
| سلێڤانی | ٨٣٧٣ | ٤٤٣٢ | ١٤٤٦ | ٩ | ٢٤٨٦ |

---

* شاكر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالي، دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية، مطبعة شفيق. بغداد، ١٩٧٣، ص١٢٦- ١٣٨. زۆربەی ژمارەكان لەلایەن (عەبدوڵلا غەفور) راستكراوەتەوە.

تێبینی: سەرچاوەكە پڕیەتی لە هەڵە، لەبەر ئەمە ناچاربووم ژمارەكان بە دەسكاریەوە وەربگرم لەبەر نەبوونی سەرچاوەی تر.

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| سندی | ١٥١٨ | ١٤٤٧ | ١٨ | - | ٥٣ |
| گولی | ٨٥١١ | ٤٥٤٢ | ١٤٦٣ | ٩ | ٢٤٩٧ |
| ئاكرێ | | | | | |
| سەنتەر | ١٠١٦٣ | ٨٤٤٤ | ١٥٤٢ | ٢ | ١٧٥ |
| سورچی | ١٠٧٧١ | ١٠٧١٣ | ٤١ | - | ١٧ |
| عەشایەر سەبعە | ١٧٤٢٤ | ١٧٠٦٤ | ١٩٤ | - | ١٦٦ |
| نەهلە | ١٥٣٩ | ١٠٢٩ | ٤٧٧ | - | ٣٣ |
| **هەولێر** | **٣٥٦٢٩٣** | **٣٠٣٣٧٧** | **٤٦٩١٥** | **١٥٣٧** | **٤٤٦٤** |
| سەنتەر | ٩٠٩٥٦ | ٨٣٠٩٤ | ٤٢١٣ | ١٤٨٧ | ٢١٥٢ |
| عەنكاوە | ٢٦١٢٢ | ٢١٩١٣ | ٤٠٥٣ | ١٣ | ١٤٣ |
| قوشتەپە | ٢٠٦٨٣ | ١٩٠٣٢ | ١٦٢٨ | ٦ | ١٧ |
| شەقلاوە | | | | | |
| سەنتەر | ٨٧٨٩ | ٧٥٠٢ | ١٢٤٢ | ١ | ٤٤ |
| هەریر | ١٣٦٦٠ | ١٣٥٥٨ | ٢٤ | - | ٧٨ |
| خۆشناو | ١١٨٢٣ | ١١٧٣٨ | ٢٤ | - | ٦١ |
| سەلاحەدین | ١٤١٣١ | ١١٥٦٣ | ٢٥٤٠ | ٨ | ٢٠ |
| زێبار | | | | | |
| سەنتەر | ٥٨٦٥ | ٥٨٢٤ | ٤١ | - | - |
| بارزان | ٤٠٩٧ | ٤٠٨٣ | ١٤ | - | - |
| مزوری بالا | ١٠٢٢٦ | ٩٦٦٦ | ٥٦٠ | - | - |
| رواندز | | | | | |
| سەنتەر | ١٨٩٥٢ | ١٥٧٠٥ | ٢٨٦٤ | ٥ | ٣٨٧ |
| بالەك | ١٥٥٤٧ | ١٢٠٠٦ | ٣٤٨٧ | ١١ | ٤٣ |
| برادۆست | ٥٩٤٠ | ٥٩١٣ | ٢٧ | - | - |

| دیانا | ٩٦٣٩ | ٧١٨٤ | ١٧٦٤ | ٢ | ٦٨٩ |
|---|---|---|---|---|---|
| مەخمور | | | | | |
| سەنتەر | ٧٣١٨ | ٤٢٧٧ | ٣٠٣٩ | ٢ | - |
| گوێڕ | ١٨٥٢٤ | ١٢١٠٨ | ٦٣٧٤ | - | ٤٢ |
| کەندیناوە | ١٨٨٧٤ | ١٤٧٢٩ | ٣٥١٨ | - | ٦٢٧ |
| قەراج | ٩٩٣٦ | ٥١٢١ | ٤٨١٠ | - | ٥ |
| کۆیە | | | | | |
| سەنتەر | ٢٩١٥٥ | ٢٥٢٠٣ | ٣٨١٨ | ١ | ١٣٣ |
| تەقتەق | ١٦٠١٦ | ١٣١٥٨ | ٢٨٧٥ | ١ | ٣٢ |
| **کەرکوک** | **٤٧٣٦٢٦** | **١٧٠٩٠٥** | **١٨٤٥٣٥** | **٤٩٢٣٩** | **٦٨٩٤٧** |
| سەنتەر | ١٨٣٩٨١ | ٧٠٨١٩ | ٤٠٥٨١ | ١٠٣١٦ | ٦٢٢٦٥ |
| تازەخورماتوو | ١٥٠٠٦ | ٢٢٤٤ | ٦٠١٧ | ٦٤٩٩ | ٢٤٦ |
| شوان | ١٥٢٧٩ | ٤٠٤٦ | ٦٧٤٥ | ٤٣١٨ | ١٧٠ |
| ئاڵتون کۆپری | ١٥٣٣٨ | ٣٩٤٤ | ٥٥١٨ | ٤٣٦٦ | ١٥١٠ |
| قەرەحەسەن | ١٦٣٦٠ | ٨٩٦٨ | ٥٧٩٩ | ١٠٨١ | ٥١٢ |
| دووبز | ٢٠٤٤٩ | ٢٧٥٩ | ١٦٩١٠ | ٩٨ | ٦٨٢ |
| توزخورماتوو | | | | | |
| سەنتەر | ٣٨٢٣٤ | ٦٦٥٠ | ١٥٧٥٤ | ١٥٤٩٧ | ٣٣٣ |
| قادرکەرەم | ١٥٩٧٧ | ٨٠٩٨ | ٧٢٠٧ | ٥٣١ | ١٤١ |
| داقوق | ١٨٩١٩ | ٨٨٩٣ | ٧٢٠٦ | ٢١٣٣ | ٦٨٧ |
| چەمچەماڵ | | | | | |
| سەنتەر | ٢١٢٣٢ | ١٠٣٩٧ | ١٠٧٢٤ | ٢٦ | ٨٥ |
| ئاغجەلەر | ١٤٠٣٤ | ١٣٧١٨ | ٢٤٤ | ٣ | ٦٩ |
| سەنگاو | ١٧٥١ | ١٧٥١ | - | - | - |
| حەویجە | | | | | |

| سەنتەر | ٢٨٣٣ | ٥٩٦ | ٢٠٦٢ | ٦٨ | ١٠٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| حەویجە | ١٨٤٩١ | ٤٠٩ | ١٧٨٥٦ | - | ٢٢٦ |
| ریاز | ١٧٣٠٨ | ٤٣٠ | ١٦٧٤٦ | ٢٨ | ١٠٤ |
| کفری | | | | | |
| سەنتەر | ٨٢٦٧ | ٥٣١٣ | ٧٢٢ | ١٤٥٣ | ٧٧٩ |
| پێواز | ٧٦٤٥ | ٤٥٤٤ | ٢٦٤٢ | ٢ | ٤٥٧ |
| شێروانە | ٢٣١١٣ | ١٢٨٠٥ | ٩٤٢٣ | ٧٢٠ | ١٦٥ |
| قەرەتەپە | ١٩٤٠٩ | ٤٥٢٢ | ١٢٣٧٩ | ٢١٠٠ | ٤٠٩ |
| **موسڵ** | **٦٢٦٤٥٩** | **١٧٤٨٢٧** | **٣٨٤٥٤٦** | **٣٦٤١٠** | **٣٠٦٧٥** |
| سەنتەر | ٢٦٤١٤٦ | ٤٠٢٣٢ | ٢١٣١٧٥ | ١٤٤٧ | ٩٢٩٢ |
| حەمدانییە | ٤٣٣٩٠ | ٤٣٤٢ | ٣١٨١٤ | ٧٢ | ٧١٦٢ |
| تلکێف | ٣١٠٣١ | ١٠٣٤ | ٢٣٨٢٨ | ٢٧ | ٦١٤٢ |
| بەعشیقە | ٢٤٧٧٣ | ٤٨٩١ | ١٨١١٢ | - | ١٧٧٠ |
| حومیدات | ٢٥٢٢٢ | ١٠٠ | ٢٤٩٩٧ | - | ١٢٥ |
| زاب | ١٣٥١٨ | ١٧٠ | ١٣٢٥٥ | - | ٩٣ |
| تەلەعفەر | | | | | |
| سەنتەر | ٣٦٩٩٨ | ٨٩٧ | ٩٨٨٨ | ٢٥٥٠٥ | ٧٠٨ |
| زومار | ٣٢٣١٨ | ١٣٧٢٦ | ١٨٣٦١ | ٨ | ٢٢٣ |
| عەیازیە | ٢٠٤٨٠ | ٢٣٤٤ | ١٢٧٩٣ | ٤١٣٦ | ١٢٠٧ |
| رەبیعە | ١٥٤٥٣ | ١٠١٩ | ١٤٣٤٧ | ٢٨ | ٥٩ |
| شێخان | | | | | |
| سەنتەر | ٢٣٠٢٥ | ١٧٥١٩ | ٣١٩١ | ٤٤٨ | ١٨٦٧ |
| تەلقوش | ١٥٨١٧ | ٩٦٤٨ | ٤٤٧٥ | ١٥ | ١٦٧٩ |
| شەنگار | | | | | |
| سەنتەر | ٧٩٨٤ | ٤٥٩٣ | ٣٣٠٣ | ٤٩ | ٣٩ |

| شەنگار | ٤٤٢٢٣ | ٢٥٥١٣ | ١٣٩٧٩ | ٤٥٤٦ | ١٨٥ |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| شیمال | ٢٨٠٨٠ | ٢٣٩٠٣ | ٣٩٢٥ | ١٢٩ | ١٢٤ |
| **سلێمانی** | **٣٩٩٧٦٨** | **٣٤٥٢٩٩** | **٥٢٥٩١** | **٤٩٤** | **١٣٨٤** |
| سەنتەر | ١٦٠٦٤٧ | - | - | - | - |
| هەڵەبجە | ٧٦٠٨٦ | - | - | - | - |
| پێنجوین | ٢٤٧٣٢ | - | - | - | - |
| شارباژێڕ | ٤٨٣٠٣ | - | - | - | - |
| پشدەر | ٤٣٠٦٣ | - | - | - | - |
| رانیە | ٤٦٩٣٧ | - | - | - | - |
| خانەقین | | | | | |
| سەنتەر | ٣٩٣١٦ | ٢٨٦٢٦ | ٧٠٤٣ | ١٦٩٩ | ١٩٤٨ |
| مەیدان | ٢٨١٨ | ٢٠٥٥ | ٧٣٩ | - | ٢٤ |
| قۆڕەتوو | ٩١٢٩ | ١٥٥١ | ٥٢٠ | - | ٥٨ |
| سەعدیە | ١٢٥٩٩ | ٢٥٦٠ | ٨٤٤٧ | ١١٠١ | ٤٩١ |
| جەلەولا | ٢٢٢٠٨ | ٤٩٤٣ | ٣٤١٨ | - | ١٣٨٤٧ |
| مەندەلی | | | | | |
| سەنتەر | ٣٢٢٨٣ | ٩٥٧٩ | ٢١٢٣٥ | ٦٤٦ | ٨٢٣ |
| بەلەدروز | ٢١٦٠٩ | - | - | - | - |
| قەزانیە | ١٩٥٦ | - | - | - | - |
| بەدرە | | | | | |
| سەنتەر | ٥٩٦٦ | - | - | - | - |
| زرباتیە | ٣٨٨٥ | - | - | - | - |
| جەسان | ٥٢٩٥ | - | - | - | - |

## سەرباری ٣

## پێکهاتنی نەتەوەیی دانیشتوان لە ئەستانەکانی باشووری کوردستاندا- ١٩٧٧*

| ئەستان | ژمارەی دانیشتوان | نەتەوە | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | کورد | عارەب | تورکمان | سریان | ئەرمەن | نەزانراو |
| هەولێر | ٥٤١٠٨٦ | ٤٦٥١٢٢ | ٥٦٠٢٥ | ٨٨٨٥ | ٩٣٢٤ | ١١٤ | ١٦١٦ |
| % | ١٠٠,٠ | ٨٦,٠ | ١٠,٤ | ١,٦ | ١,٧ | - | ٠,٣ |
| دهۆک | ٢٥٠٢٨٣ | ١٩٠١٦١ | ٤٦٢٩٦ | ٥٠٥ | ١١٧٠٥ | ٨٨١ | ٧٣٦ |
| % | ١٠٠,٠ | ٧٦,٠ | ١٨,٥ | ٠,٢ | ٤,٦ | ٠,٤ | ٠,٣ |
| خانەقین | ٢٨٤٧٥٨ | ٧٢٨٩٨ | ١٩٢٧٨١ | ١٧٣٧٠ | ٢٥٢ | ٢٣ | ١٤٣٤ |
| % | ١٠٠,٠ | ٢٥,٦ | ٦٧,٧ | ٦,١ | - | - | ٠,٥ |
| سلێمانی | ٦٨٩١١٩ | ٦٤٧٣٤١ | ٣٧٧٢٢ | ٨٧٠ | ٤٥٦ | ٥٧ | ٢٦٧٣ |
| % | ١٠٠,٠ | ٩٣,٩ | ٥,٥ | ٠,١ | - | - | ٠,٤ |
| کەرکوک | ٤٩٢٦١٥ | ١٨٥٢٦٣ | ٢١٨٧٥٥ | ٨٠٣٤٧ | ٤٠٥٠ | ٥٨١ | ٣٦١٩ |
| % | ١٠٠,٠ | ٣٧,٦ | ٤٤,٤ | ١٦,٣ | ٠,٨ | ٠,١ | ٠,٧ |
| نەینەوا | ٩٤٢٥٣٦ | ١٢٥٣٥٧ | ٨٠٤٨١٦ | ٨٤٨٣ | ٩٤٢ | ١١١ | ٢٨٢٧ |
| % | ١٠٠,٠ | ١٣,٣ | ٨٥,٤ | ٠,٩ | ٠,١ | - | ٠,٣ |
| هی دیکە | ٩٠٦١١ | ٢١٤ | ٨٨٢٥٥ | ١٨١ | - | - | ٩١ |
| % | ١٠٠,٠ | ٢,٣ | ٩٧,٤ | ٠,٢ | - | - | ٠,١ |
| تێکرا | ٣٢٩١٠٠٨ | ١٦٨٨٢٢٦ | ١٤٤٤٦٤٩ | ١١٦٦٤١ | ٢٦٧٢٩ | ١٧٦٧ | ١٢٩٩٦ |
| % | ١٠٠,٠ | ٥١,٣ | ٤٣,٩ | ٣,٥ | ٠,٨ | ٠,١ | ٠,٤ |

* فەیسەڵ دەباغ، کوردو کەمە نەتەوایەتیەکانی تر لە سەرژمێریساڵی ١٩٧٧، بەشی یەکەم، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر، ١٩٧٧، ل ١٥-١٨.

تێبینی: سەرجەمی دانیشتوان لەم تابلیە ١٢٣٠٢ کەس کەمترە لەو ژمارەیەی لە (نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧) بلاوکراوەتەوە.

## سەرباری ٤

### پێکهاتنی نەتەوەیی دانیشتوان لە قەزایەکانی باشووری کوردستاندا- ١٩٧٧ *

| قەزا | نەتەوە | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کورد | عارەب | تورکمان | ئەرمەن | سریان | هیدیکە | سەرجەم |
| **هەولێر** | | | | | | | |
| سەنتەر | ٨٧,٩٠ | ٦,١٠ | ٣,١٧ | ٠,٠٣ | ٢,٤٣ | ٠,٣٧ | ١٠٠,٠ |
| چۆمان | ٧٤,٥٠ | ٢٤,٨٣ | ٠,٣٥ | – | ٠,١٧ | ٠,١٥ | ١٠٠,٠ |
| رواندز | ٨٣,٩٠ | ١٤,٨٢ | ٠,٢٠ | ٠,٠٣ | ٠,٩٣ | ٠,١٢ | ١٠٠,٠ |
| زێبار | ٨٠,٢٨ | ١٨,٨٨ | ٠,٢١ | – | ٠,٤٠ | ٠,٢٣ | ١٠٠,٠ |
| شەقلاوە | ٩٢,١١ | ٤,١٩ | ٠,٠٧ | ٠,٠٣ | ٣,٥٢ | ٠,٠٨ | ١٠٠,٠ |
| کۆیە | ٩٨,٦٣ | ١,١١ | ٠,٠٢ | – | ٠,١٤ | ٠,١٠ | ١٠٠,٠ |
| مەخمور | ٦٩,٥٠ | ٢٩,٨٦ | ٠,٤٠ | – | ٠,٠٢ | ٠,٢٢ | ١٠٠,٠ |
| **دهۆك** | | | | | | | |
| سەنتەر | ٧٥,٣٧ | ١٨,٣٧ | ٠,٢٧ | ٠,١٤ | ٥,٤٥ | ٠,٤٠ | ١٠٠,٠ |
| ئامێدی | ٨٤,٢٨ | ٨,٤٩ | ٠,١٢ | ٠,٠١ | ٦,٩٣ | ٠,١٧ | ١٠٠,٠ |
| زاخۆ | ٦٨,٥٩ | ٢٨,٥٨ | ٠,١٩ | ٠,٩٩ | ١,٣٨ | ٠,٢٧ | ١٠٠,٠ |
| **سلێمانی** | | | | | | | |
| سەنتەر | ٩٣,٨١ | ٥,٣٣ | ٠,١٨ | ٠,٠٢ | ٠,١٦ | ٠,٤٤ | ١٠٠,٠ |
| پشدەر | ٩٩,٥٧ | ٠,٢٦ | – | – | – | ٠,١٧ | ١٠٠,٠ |
| پێنجوێن | ٩٣,٨٨ | ٥,٧٧ | ٠,٠٣ | – | – | ٠,٣٢ | ١٠٠,٠ |
| چەمچەماڵ | ٩٤,٧٠ | ١,٩٠ | ٠,٠٤ | – | – | ٠,٣٦ | ١٠٠,٠ |
| دەربەندیخان | ٩١,٤ | ٧,٦ | ٠,١٥ | – | ٠,٢١ | ٠,٦٤ | ١٠٠,٠ |
| دوکان | ٩٣,٠١ | ٦,٧ | ٠,١٣ | – | ٠,٠٣ | ٠,١١ | ١٠٠,٠ |

* هەمان سەرچاوە، ل ٢٦-٣١.

| رانیه | ٩٧,٠٠ | ٢,٧٥ | ٠,٠٤ | ٠,٠١ | ٠,٠١ | ٠,١٩ | ١٠٠,٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| شارباژێر | ٩٠,٥١ | ٨,٧٩ | ٠,١٨ | - | - | ٠,٥٢ | ١٠٠,٠ |
| کەلار | ٨٥,٣١ | ١٤,١٥ | ٠,٢٤ | - | - | ٠,٣٠ | ١٠٠,٠ |
| هەڵەبجە | ٩٤,٧٢ | ٤,٧٠ | ٠,٠٩ | - | - | ٠,٤٨ | ١٠٠,٠ |
| **کەرکوک** | | | | | | | |
| سەنتەر | ٤٠,٥٩ | ٣٨,٤٦ | ١٩,٠٤ | ٠,١٤ | ٠,٩٨ | ٠,٧٩ | ١٠٠,٠ |
| حەویجە | ٣,٩٧ | ٩٥,٠٣ | ٠,٨٠ | - | - | ٠,٢٠ | ١٠٠,٠ |
| دوبز | ٥٢,٢٢ | ٣٧,٨٩ | ٨,٥٩ | ٠,٠٣ | ٠,٣٢ | ٠,٩٥ | ١٠٠,٠ |
| **نەینەوا** | | | | | | | |
| سەنتەر | ١٠,٠٨ | ٨٨,٣٨ | ١,١٠ | ٠,٠٢ | ٠,٠٧ | ٠,٣٥ | ١٠٠,٠ |
| ئاکرێ | ٩١,٠٩ | ٧,٩٩ | ٠,٠٦ | ٠,٠١ | - | ٠,٩٣ | ١٠٠,٠ |
| تەلەعفەر | ٣,٢١ | ٩٥,٥٤ | ١,٠٢ | - | - | ٠,٢٣ | ١٠٠,٠ |
| تلکێف | ١,٩٧ | ٩٥,٨١ | ٠,٤٩ | - | ١,٣٨ | ٠,٣٥ | ١٠٠,٠ |
| حەمدانیە | ٣,٧٩ | ٩٢,٩٧ | ٣,١١ | - | - | ٠,١٣ | ١٠٠,٠ |
| شەنگار | ٣٢،٦ | ٠٥،٩٣ | ٤٢،٠ | - | ٠١،٠ | ١٩،٠ | ١٠٠,٠ |
| شێخان | ٣٦,٩٧ | ٦٢,١٠ | ٠,٢١ | - | - | ٠,٧٢ | ١٠٠,٠ |
| خانەقین | ٢٧,٢٨ | ٦٧,٨٦ | ٤,٠٥ | ٠٣،٠ | ٠,٠٣ | ٠,٧٥ | ١٠٠,٠ |
| کفری | ٥١,٥٤ | ٤١,٨٩ | ٥,٧١ | ٠,٠١ | ٠,٠١ | ٨٤،٠ | ١٠٠,٠ |
| مقدادیە | ٤,١١ | ٩٥,٣٠ | ٠,٣٢ | ٠,٠٣ | ٠,٠٣ | ٠,٢١ | ١٠٠,٠ |
| مەندەلی | ١,٤١ | ٩٨,٤١ | ٠,٠٦ | - | ٠,٠٣ | ٠,١٢ | ١٠٠,٠ |
| بەدرە | ٠,٣٧ | ٩٩,٥٤ | - | - | - | ٠,٠٩ | ١٠٠,٠ |
| توزخورماتو | ٥٤,٢٨ | ٣٥,٣٥ | ١٨,٤٣ | ٠,٠١ | - | ٠,٩٣ | ١٠٠,٠ |

## سەرباری ٥

### پۆلینکردنی شارەکانی باشووری کوردستان-١٩٦٥*

| دەستە | ژمارەی شار | دانیشتوان | |
|---|---|---|---|
| | | هەزار | ٪ |
| ١٠٠ و زیاتر | ٢ | ٤٣٩ | ٥،٤٥ |
| ١٠٠-٥٠ | ٢ | ١٧٥ | ٢،١٨ |
| ٥٠-٣٠ | ١ | ٣٧ | ٨،٣ |
| ٣٠-٢٠ | ١ | ٢٣ | ٤،٢ |
| ٢٠-١٠ | ٨ | ١٠٢ | ٦،١٠ |
| ١٠-٥ | ١٣ | ٨٩ | ٢،٩ |
| ٥-٢ | ٢٠ | ٦٠ | ٢،٦ |
| لە ٢ کەمتر | ٥٥ | ٣٩ | ١،٤ |
| تێکرا | ١٠٣ | ٩٦٤ | ١٠٠ |

* الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، جهاز المركزى للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٦٥، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء- بغداد ١٩٧٧، ص٣-١٤.

## سەرباری ٦

### ڕێزکردنی شارەکانی باشووری کوردستان بەگوێرەی ژمارەی دانیشتوان- ١٩٧٧*

| | |
|---|---|
| موسڵ | ٤٢٩٨٨٣ |
| کەرکوك | ٣٠٧٤٦٣ |
| هەولێر | ١٩٣٥٥٨ |
| سلێمانی | ١٧٥٤١٣ |
| تەلەعفەر | ٥٧٤٨٣ |
| دهۆك | ٤٠١٩١ |
| زاخۆ | ٣٠٢٩٩ |
| خانەقین | ٢٩١٢٧ |
| هەڵەبجە | ٢٢٤١١ |
| توزخورماتوو | ٢١٥٥٨ |
| مقدادیە | ٢١٣٤٥ |
| جەلەولا | ١٩٢٦٨ |
| مەندەلی | ١٥٤٧٤ |
| کۆیە | ١٥٣١٩ |
| قەلآدزێ | ١٣٦٨٥ |
| چەمچەماڵ | ١٣٤٢٣ |

* الجمهورية العراقية، وزارة التخطط، جهاز المركزى للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧،لمحافظة اربيل، دهوك، ديالى، السليمانية، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء- بغداد ١٩٧٨.

| کفری | ١٠٧١٥ |
| --- | --- |
| شەقلاوە | ٩٨٢٦ |
| دەربەندیخان | ٩٤٦٠ |
| قەرەقوش | ٩٣٨٧ |
| کەلار | ٩٢٧٤ |
| باشیقە | ٨٨٤٣ |
| سەرچنار | ٨٧٣٧ |
| دوویز | ٨٦٤٣ |
| رانیە | ٨٥٩٤ |
| رواندز | ٨٥٨٣ |
| پێنجوێن | ٨٥٥٤ |
| ئاکرێ | ٨١٢٢ |
| رانیە | ٧٩٣٢ |
| سەیدسادق | ٧٨٩٥ |
| سیمێل | ٧٧٨١ |
| سەرسەنگ | ٧٧٦٠ |
| حەویجە | ٧٥٩٥ |
| سەعدیە | ٧٣٩٦ |
| دیانا | ٧٠٨٤ |
| ئامێدی | ٦٩٤٦ |
| تازە خورماتوو | ٦٨٨٣ |

| تلکێف | ٦٧١٩ |
|---|---|
| گەلاڵە | ٦٦٦٠ |
| شەنگار | ٦٣٣٨ |
| بەلەدروز | ٦٣٣٠ |
| بیارە | ٦٢٠٦ |
| عەنکاوە | ٥٧٥٥ |
| مەخمور | ٥٣٠٧ |
| عەینسفنی | ٥٢٧٢ |
| چۆمان | ٥٠٢٢ |
| باتوڤە | ٤٩٢٠ |
| پردێ | ٤٨٤٠ |
| مێرگەسور | ٤٥٥٥ |
| سەلاحەدین | ٤٤٥١ |
| سنونی | ٤٢٠٣ |
| دوکان | ٣٩٤٠ |
| بەرتللە | ٣٩٤٠ |
| قەرەتەپە | ٣٩١٢ |
| هەریر | ٣٧٥٥ |
| خەلیفان | ٣٧٠٠ |
| داقوق | ٣٦٢١ |
| بەدرە | ٣٥٥٩ |

| ئەلقوش | ٣٥٢٥ |
|---|---|
| عەربەت | ٣٣٩٦ |
| شەرانش | ٣٣٢٠ |
| سەنگەسەر | ٣٢٤٧ |
| هەنجیرۆك | ٣١٩٢ |
| ئامرلی | ٣١٦٣ |
| شەك | ٢٩٣٧ |
| سلێمان بەگ | ٢٨٨٥ |
| قەزانیە | ٢٨٠٨ |
| ماوەت | ٢٧٦٠ |
| ئاڤەگەنی | ٢٧٤٧ |
| زومار | ٢٦٢١ |
| دیبەگە | ٢٥٧٨ |
| مەنسوریە | ٢٤٢٩ |
| لەیلان | ٢٣٩٣ |
| ریاز | ٢٣٠٥ |
| گۆپتەپە | ٢٢٨٨ |
| خورماڵ | ٢٢٣٦ |
| جەسان | ٢٢٣٤ |
| حومیدات | ٢٢٢٣ |
| چوارتا | ٢٢١٦ |

| گوێڕ | ٢٠٠٨ |
|---|---|
| یایەجی | ١٩٤٥ |
| هێرۆ | ١٨١٥ |
| شیروان مەزن | ١٦٣٥ |
| رەبیعە | ١٦١١ |
| زاوێتە | ١٦٠٣ |
| بەردەرەش | ١٥٥٢ |
| وانە | ١٥١٧ |
| تەقتەق | ١٤٧٧ |
| بەرزنجە | ١٤٧٠ |
| بێبۆ | ١٤٥٧ |
| خەلەكان | ١٤٤٩ |
| دینارتە | ١٤٣٣ |
| مانگێش | ١٤١٩ |
| كەڵەك | ١٤١٤ |
| بنگرد | ١٣٩٩ |
| باوەنور | ١٣٧٩ |
| قەرەداغ | ١٣٦٣ |
| قادركەرەم | ١٣٥٣ |
| زورباتیە | ١٢٥٥ |
| ئاغجەلەر | ١٢٣٩ |

| باسنێ | ١٢٣٠ |
|---|---|
| هیران | ١٢٢٠ |
| جەبارە | ١١٧٧ |
| قوشتەپە | ١١١٧ |
| جبور | ١٠٢٥ |
| گردەسێن | ٩٥٧ |
| سیدەکان | ٩٤٩ |
| کێلە سپی | ٨٤٣ |
| بجێل | ٨٣٥ |
| مرێبا | ٧٧٨ |
| خزر | ٧٥٥ |
| رێدار | ٧٢٤ |
| ئاسهێ | ٦٨٤ |
| برایم خەلیل | ٦٦٧ |
| بێتواتە | ٥٨٠ |
| نەوجول | ٥٤٣ |
| سەر قەلاّ | ٥٤٠ |
| ئەتروش | ٤٤٠ |
| سەردەشت | ٤٠٣ |
| گەرمك | ٣٨٣ |
| تەیناڵ | ٣٨٢ |

| کانی ماسی | ٣٥٧ |
|---|---|
| دێگەڵە | ٣١٣ |
| مەیدان | ٢٣٥ |
| قورەتوو | ١٤٣ |
| تیلکۆ | - |
| حاجی ئۆمەران | - |
| کۆکس | - |
| باقرتە | - |

## سەرباری ٧

### ڕیزکردنی شارەکانی باشووری کوردستان بەگوێرەی ژمارەی دانیشتوان -١٩٨٧*

| | |
|---|---|
| موسڵ | ٦٦٤٢٢١ |
| هەولێر | ٤٤٥٩٣٧ |
| کەرکوک | ٣٩٩١٨٩ |
| سلێمانی | ٣٦٤٠٩٦ |
| دهۆك | ١١٤٣٢٢ |
| تەلەعفەر | ٩٠٨٨٥ |
| کەلار | ٦٣١٠٢ |
| زاخۆ | ٦٠٦٥٥ |
| چەمچەماڵ | ٥٠٣٠٠ |
| رانیە | ٤٩٩٨٦ |
| توزخورماتوو | ٤١٢٤١ |
| کۆیە | ٣٩٤٨٤ |
| سنونی | ٣٩٤٥٧ |
| مقدادیە | ٣٧٤٤٤ |
| هەڵەبجە | ٣٧٠٤٩ |

---

* الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، جهاز المركزى للاحصاء، مديرية الحصاء السكانى، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧، لمحافظة اربيل، دهوك، ديالى، السليمانية، صلاح الدين، كركوك، نينوى، واسط، مطبعة الجهاز المركزى للاحصاء- بغداد ١٩٨٨.

| تەلكێف | ٣٦٧٢٣ |
| --- | --- |
| بەلەدروز | ٢٨٩١٨ |
| جەلەولا | ٢٦٦٦٦ |
| تازەخورماتوو | ٢٦١٩٣ |
| كفری | ٢٢٠٢٦ |
| عەنكاوە | ١٩٣٤٠ |
| قەرەقوش | ١٨٩٩٨ |
| خانەقین | ١٨٠٥٧ |
| قیرەوان | ١٧٩٤٨ |
| شەقلاوە | ١٧٥٦٥ |
| ئاكرێ | ١٦٨٢٤ |
| هەریر | ١٦٦٣٣ |
| سیمێل | ١٥٦٠٤ |
| دەربەندیخان | ١٥٣٥٠ |
| باشیقە | ١٤٨٩٥ |
| قەلادزێ | ١٤٤٨٧ |
| حەویجە | ١٣٤٦٢ |
| مەخمور | ١٢٧٨٥ |
| دیانا | ١٢٣٢٦ |
| كێلەسپی | ١١٩٠٣ |
| دوویز | ١٠١٣٣ |

| بەرتللە | ٩٥٧٤ |
| --- | --- |
| زەرایەن | ٩٣٥٧ |
| سەعدیە | ٩٣٣٣ |
| عەینسفنی | ٩٣٢٧ |
| رواندز | ٨٦١٦ |
| شەنگار | ٨٣٣١ |
| دوکان | ٨٢٠٧ |
| سەرچنار | ٧٥١٣ |
| پردێ | ٧٢٨٣ |
| سەلاحەدین | ٧١٢٩ |
| تازەخورماتوو | ٦٥٦٠ |
| قەرەتەپە | ٦١٣٠ |
| خەلیفان | ٦٠٥٠ |
| سۆران | ٥٦٦٧ |
| باتوفە | ٥٥٦٤ |
| ئامرلی | ٥٤١٨ |
| مەنسوریە | ٥٣٧٧ |
| داقوق | ٥٢٥٢ |
| عەربەت | ٥٢٢٥ |
| زاب | ٤٩٢٦ |
| ئامێدی | ٤٨٧٢ |

| سلێمان بەگ | ٤٨٢٦ |
| --- | --- |
| ئەلقوش | ٤٧٩٥ |
| بەردەرەش | ٤٥٧٣ |
| سەنگەسەر | ٤٤٤٧ |
| ئاڤەگەنی | ٤٤٠٢ |
| خەلەکان | ٤٠٧٤ |
| بیبۆ | ٤٠٤١ |
| سەرسەنگ | ٤٠١٣ |
| حومیدات | ٣٩٨٨ |
| ریاز | ٣٩٣٧ |
| شەرانش | ٣٥٥٨ |
| گوێڕ | ٣١١٧ |
| باوەنور | ٣٠٢٦ |
| زومار | ٢٩٥٤ |
| جەسان | ٢٩٢٢ |
| رەبیعە | ٢٨٠٠ |
| جبور | ٢٥٤٩ |
| تەیناڵ | ٢٦٢٨ |
| مانگێش | ٢٢٦٤ |
| بەرزنجە | ٢١٥٢ |
| فەیدێ | ٢٠٣٨ |

| چوارتا | ١٥٠٨ |
| --- | --- |
| باقرتە | ١٤٦٩ |
| قەزانیە | ١٤٤٠ |
| خزر | ١١١٧ |
| ئاسهێ | ١٠٥٠ |
| زاوێتە | ٧٢٩ |
| بەدرە | ٤١٠ |
| خەلەکان | ٢٠٣ |
| مەندەلی | ١٣ |
| پێنجوین | - |
| بێتواتە | - |
| کارێزە | - |
| مێرگەسور | - |
| کانی ماسی | - |
| چۆمان | - |